چەند باسێک
لە
چڵە پۆپەدا

١

# بۆ هەموو
# کیژێکی خاوەن باوەڕ



## عمر أحمد نظامي

چاپی یەکەم
١٤٠٥ ـ ١٩٨٥
مطبعة الارشاد

«مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ» النمل .

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله حمــداً يوافي نعمه ، ويكافيء مزيده ، سبحانك اللّهمّ لا أُحصي ثناء عليك أنت كما أثنيْت على نفسك .

وصل اللّهم أفضل صلواتك على خـاتم رســلك وأنبيائك سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين .

خوايه دڵم بەنووری خۆت رووناك بکەرەوە ! کارم بـۆ ئاسانبکـە ! نیعمــەتی ئیخلاصــم پێ ببەخشــە ! لــە خراپەی نەفسو هــەوا بمپارێزە ! لــەداوو کەمینەکانی شەیتان لامدە ! تۆ باشترین گەورەو باشترین پاڵپشتی !

# پێشـــەکی

گەورەترین خزمەت ئـەمڕۆ بەئافرەت بکرێ ئـەوەیە دۆستو دوشمنی خۆیان پێ بناسێنرێو ، بۆیان روون بکرێتەوە کە کێ بەراستی دڵسۆزیانـەو مەبـەستی لـەنوسینو گفتو گۆ لەگەڵیانا سەربـەرزیو رەوشت بەرزیو داوێن پاکی ئەوانە ، وەکێش ئەیەوێ بەناوی دڵسوزیو ئامۆژگاری‌یانەوە مەبەستی چەپەڵی خۆی بەدەس بێنێو ئارەزووی خۆی تێر بکا •

چونکە ئافرەت هەرکات ئەمەی زانی ئەوە هەمیشە ووریا ئەبێو قسە لەدوشمنانی وەرناگرێو بەگوێیان ناکات ، هەرچەند بەجۆرەها شێوە بیرازێننەوەو بەرواڵەت جوانو شیرینی بکەن لە پێش چاویاو ، جۆرەها ناوی وەك : پێشکەوتنو سەربـەستیو مافی ئافـرەتو ••• هتـد لێ بنێن • وەبەپێچەوانەی ئەمەوە قسـەو ئامۆژگاری دڵسۆزانی ئـەخاتە سەرچاو هەرچەند بەربـەسی هـەواو هەوەسو ئارەزووی ناڕەوایشی تیابێتو بەرواڵەت لەبەرشان گران بێتو بەناهەق پێی بوترێ کۆنەپەرەستیو دواکەوتوویی‌و وشکی‌و ••• هتد •

ئـەم هەڵسەنگاندنو گێچو تەتەڵەیە بۆ جیـا کردنەوەی دۆستو دوشمن گەلێ پێویستە خوشکی ئافرەت بیکا • چونکە لەراستیدا ئافرەت کلیلی دەرگای ئیصلاحو چـاك بوونی کۆمەڵە ، وەهەوێنی گرساندنی ئەو ماستەیە ، وەهەتا ، ئافرەت لێ نەنەوێو لێ‌نەبڕێو ، شان‌بەشانی پیاو هەوڵی چارەسەرکردنی نەخۆشی‌یە رەوشتی‌و کۆمەڵایەتی‌یەکان نەدات ، هەرچی هەوڵو کۆششی خێرخواهان هـەیە هەمووی بێ سود ئەبێو

وەك ئاوەكەی پارئەڕوات ، وەك مامۆستا جوتیار ئەم مەبەستە بەجوانی لەپارچە شیعرێكا دەرئەبڕێو ئەمە سەرەتاكەیەتی :

خوشــــكی ئافـــرەتی پـاك داوێن
ئــەی ناسكۆڵەی روومەت خاوێن

بـەتۆیـە سـەربـەرزی كۆمـەڵ
ئـەی بۆرزگاری تۆی مەشخەڵ

میللــــەت كـــاتێ بەختیـــارە
كـــەدی ئافـــرەتی هۆشـــیارە[1]

خوشكی بەڕێزم ! ئایا ئـەو كەسەی پێت ئـەڵێ : خوشكم داوێن پاكبەو ، سەرو ملو قۆڵو بازووت بۆ هەموو پاكو ناپاكێ دەرمەخە . لەسنووری ماڵی خۆتدا بۆ مێردت یان بۆ باوكو برات قەیناكە ، بەڵام خـۆ رووت كردنەوەی تۆ لەسـەر جادەو كۆڵانەكانداو ، لەقوتابخانەو زانكـۆو دائیرەكاندا ، هیـچ مانای تیانیەو هیـچ یارمەتی پێشكەوتن‌و زانستی‌و كاركردنت نادات ، بـەڵكو بـەپێچەوانەوە خۆرازاندنـەوەی رۆژانەت زۆر لەكات‌و ماڵت بەفیڕۆ ئەبات‌و لەكاروان دوات ئەخات ؛ ئـەوكەسەی ئـەمەت پێ ئەڵێ : بۆ ئـەبێ پێی بوترێ كۆنەپەرەست‌و دواكەوتو ؟! .

لـەراستیدا رۆژانی رابوردو پێی سـەلماندین كـە چاولێكـەری كوێرانەمان بۆرۆژئاوا لـەزۆر لایەنەكانی ژیانمانا ، بـەتایبەت لەجل‌و بەرگی ئافرەتدا ، بێجگە لەنەگبەتی‌و بەدبەختی هیچی پێشكەش نەكردین ، وەكاروانی راپەڕین‌و پێشكەوتنمانی بەهیچ جۆرێ بەرەو پێش نەبرد ،

---

(١) بڕوانە : چرۆی باوەڕ ، ل : ١٣ .

وەئیتر کاتی ئەوەمان هاتووە یادێ بکەینەوەو ئەوەندە بەکوێرانە دوای ئەوان نەکەوینو ، گۆرانی بەبالآی ئەوانا نەلێین •

ئەم نامیلکەیەی بەردەمیشمان کەمن لەمشێوە کوردی‌یەدا خستومەتە پێش چاوی خوێنەری بەرێز[1] ، تارادەیەك بەدرێژی بەرپەرچی هەموو ئەو پیلانو فێڵو تەڵەکانەی تیایە کە دوژمنانی ئیسلام ئەیانەوێ کیژی موسوڵمانی پێ وێل بکەنو لەرێگا لایبدەن • وەهەروەها چارەسەری ئەو گیرو گرفتانەی تیایە کەلەم رووەوە رێگا بەخوشکی موسوڵمان ئەگرنو نایەڵن هەنگاو بەرەو چاکە هەڵگرێ •

جابۆیە ئەڵێم داوام وایە لەهەمو خوشکێك بەگیانێکی لێ‌بڕانو بێ لایەنی هیچ هەواو ئارەزوویەك بیخوێنێتەوەو بیری لێ بکاتەوە ، بەڵکو لەم چەند لاپەڕەیەدا دەرمانی دەروونیان بدۆزنەوەو بەرەو راستی بکەونەڕێ ، وەمنیش بەم هۆیەوە هەندێ پێویستی سەرشانی خومم بەجێ هێنابێ ( ان أريد الا الاصلاح ما استطعت وما توفيقي الا بالله عليه توكلت واليه أنيب ) •

**عمر احمد نظامي**
**بغداد – ١٤٠٤ك – ١٩٨٤م**

---

(١) ئەم نامیلکەیە یەکێکە لەزنجیرەی ( أبحاث في القمة )و دانراوی د• محمد سعيد رمضان البوطي یەو من بەهەندێ دەسکاریەوە وەرم **گێڕاوە** •

# بۆ هەموو کیژۆڵەیەك باوەڕی بەخوا هەبێ

مەبەستم لەکیژۆڵەی خاوەن باوەڕ کیژێکە ، کەیەقینی بە بوونی پەروەردگارێکی تاقو تەنیا لەزاتو سیفاتیا هەبێ ، وەباوەڕی وابێ کەسێکی تر بێجگە لەخوا تواناى نیە سودو زیانی پێ بگەیەنێ ، وەپاش مردنو لەرۆژی قیامەتدا هەموو کەس بۆ لای خوا کۆ دەکریتەوەو بەترازووی هەستیاری خوا کردەوەکانی دەکێشرێ ، لەو رۆژەدا هەموو شت بەجوانی دەرئەکەوێو پەردە لەسەر هەموو نادیارو شاراوەیەك لائەبرێ • رۆژی پەشیمانیو ئاهی ساردە بۆ کەسێ بەژیانی دنیا هەڵخەڵەتابێو کەمتەرخەم بوبێ لەئاستی فەرمانەکانی خوادا ، وەرۆژی دڵخوشیو کامەرانییە بۆ کەسێ بەراستی لە دنیا گەیشتبێو رێگەی رەزامەندی خوای تیادا گرتبێتە بەر •

کەوابوو مەبەستم ئەو کیژە نیە کە ناوی خوای بیستبێو هیچی لێ تێنەگەشتبێ ، ووشەی باوەڕی بەزمان وەرگرتبێو دەماودەم بۆی هاتبێو ، ماناو ناوەڕۆکەکەی وەك باوەڕ لەدڵیدا نەچەسپابێ • لەوانەیە رۆژی بیست جار ناوی خوا بەسەر زاریا بێت ، بەڵام بەمانگێ یان ساڵێ جارێ بیرێ لە تواناو دەسەڵاتی خوا ناکاتەوە •

وەئەگەر خوای بخەنەوە یاد ، یاخود خۆی بیری لێ بکاتەوە ، هیچی لێ تێناگا ئەوە نەبێ — وەك ئەڵێن — راستییەکی گەورەو نادیارە وەك ئەوە پێی ئەڵین ( ئەثیر ) وەشتێکی دیکەی لێ نازانێ ئەوە نەبێ نهێنییەکی شاراوەیە لە نهێنییەکانی بوونەوەر •

ئەم باوەڕە پێی ناوترێ باوەڕ تەنیا بەشێوەی مەجازو لەیەکچواندن نەبێ ، وەئەم باوەڕە بێئەرکە زۆرو زەبەنەیە لەکۆمەڵگاکانی ئەوروپاو لەناوچەکانی ئەمریکاداو ، دەبینی شان بەشانی ئەو بێ رەوشتیو ، گرێ کوێرە دەروونی‌یانەو ، رۆچوون لەژیانی بەرەڵڵایی‌و ، سەرگەردانی ژیانی مادی‌یەدا ، کە ئەو کۆمەڵگایانە قوڵپی تیائەدەن دەڕوا •

من لەم نامیلکەیەدا قسە لەگەڵ کیژێکدا ئەکەم کە باوەڕی بەخوا هێنابێ ، باوەڕێك بەخواست‌و سەربەستی خۆی ، کە لەناخی دڵ‌و هەستی دەروونەوە هەڵقوڵابێ ، وەدڵنیایشم ئەم کۆمەڵگایەمان زور لەو کیژانەی تێدایە کە خاوەنی ئەم جۆرە باوەڕەن •

رووی دەمم ئەکەمە ئەو کیژۆڵەیەی کە لەسەرچاوەی دڵیەوە ئەم باوەڕەی هەیەو پێی ئەڵێم :

خوشکم ! بوونی ئێمە لەم ژیانەدا راستی‌یەکی گرنگ‌و پڕمانایە ، هیچ شێوە رابواردنێکی ئەم ژیانە پاشە رۆژت لە بەرچاو وون نەکاو ، لەیادت نەچێ کە دنیا چەندە بێ‌نرخ‌و کەم بایەخە ، هەرچەند ئەبینی خەڵك زور باوەشیان پیا کردووەو هەڵپەی بۆ ئەکەن ، وەباش بزانە کە ئەم ژیانە ساتێکی تاقی‌کردنەوەیەو خەڵك پیایدا تێئەپەڕن ئیتر ئاگاداربن یان‌نا ، وەکێ ئەزانێ ئەم ساتە کورتە یان درێژە ؟ •• هەرچۆن بێ ساتێکی تاقیکردنەوەیەو زیاتر نیە •

پیاوو ئافرەت هاوبەشن لەتێپەڕبوون بەم ساتە تاقیکردنەوەداو شان بەشانی یەك بەرپرسیارن ، بەڵام ئافرەت لەپیاو جیا ئەبێتەوە بەهاڵگرتنی کۆڵێکی تر کە گەلێ سامناکە لەدنیاو پاشە رۆژدا •

ئافرەت لەگەڵ ئەوەدا لەم تاقیکردنەوەدا بەشداری پیاوە ، لەهەمان کاتدا بەگرنگترین وانە لەوانەکانی ئەم تاقیکردنەوە دائەنرێ •

چونکە هەواو ئارەزوو بەهەموو جۆرەکانیەوە خلیسکانەیەکی تاقیکردنەوەیە خوا لەسەر رووی ئەم جیهانەدا بلاوی کردوەتەوە • خۆ ئافرەتیش بەگوێرەی فەرموودەی خوا یەکەمین جۆرە لەجۆرەکانی ئارەزوو ، وەك خوا ئەفەرموێ :

« زين للناس حب الشهوات من النساء والبنين والقناطير المقنطرة من الذهب والفضة والخيل المسومة والأنعام والحرث ذلك متاع الحياة الدنيا والله عنده حسن المآب » آل عمران : ١٣ •

واتە : جوانکراوە بۆ ئادەمیزاد خۆشەویستی هەواو ئارەزوو لە : ئافرەتی جوانو ، کوڕو ، سامانو دارایی زۆری ئاڵتونو زیوو ، بەرزە وڵاخی نیشانەدار کراوو هەڵکەوتوو ، مەڕو ماڵاتی جۆراو جۆرو ، زەویو زار • وەئەمانە هەمووی رابواردنی ژیانی دنیایە ، وەجوانترین رابواردنو ئارامگای پڕ لەئاسایشو بێ دەردو سوێ لەپاشە ڕۆژدایە •

ئەوەتە ئافرەت لەیەکەمین پلەی ئەو ئارەزووانەدایە کە خوا دایناون بۆ تاقیکردنەوە لەڕێگای ئادەمیزادا • وەئەگەر ئافرەت لەهەموویان زیاتر جێگای مەترسی نەبوایە خوا لەپێش هەموویانەوە باسی نەئەکرد •

کەوابوو ئافرەت لەژیانی مرۆڤایەتیدا لەهەموو تاقیکردنەوەیەك ترسناکترە ، چونکە هەموو ئەو تاوانانەی خوا لەسەر بەندەکانی حەرامی کردوون ، بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ سروشتی ئادەمیزادا ناگونجێن ، بۆ نمونە : زوڵمو ستەم بەهەموو جۆرەکانییەوە حەرامن ، وەسروشتی ئادەمیزادیش پێی ناخۆشە • عەرەق خواردنەوە حەرامە ، وەسروشتی ئادەمیزادی رەسەنیش قێزی لێ ئەکاتەوە ، هەروەها دزیو گزیو دووزمانیو هەموو شتەکانی تر کەحەرامن ، لەگەڵ سروشتی پاکی

ئادەمیزادا رێك ناكەون ، مەگەر كەسێ لایدابێو سروشتی تێكچوبێو بەپاكیو خاوێنی نەمابێتەوە •

بەڵام تەنها شتێك لەم رێبازە گشتییە ( القاعدة العامة ) جودا ئەكرێتەوە كەئەویش ئارەزووی جنسییە لەپیاویشو لەئافرەتیشدا • ئارەزووی جینسی هەرچەند ئادەمیزاد هەڵئەنێ بۆ خراپەیەك كە دائەنرێ نە چڵەپۆپەی ئەو شتانەدا شەرع حەرامی كردوون ئەگەر سنورێكی دیاری كراوی بۆ دانەنرێ ؛ لەهەمان كاتدا بە پێویستترین داخوازییەكانی سروشتی ئادەمیزا دائەنرێ بەشێویەك كەهیچ مرۆڤێكی رێكوپێك ناتوانێ وازی لێ بهێنێو لەدەستی رابكات •

خوشكی بەرێزم ! لە تویێ ئەم بەراوردەدا بۆت دەرئەكەوێ كە ئارەزووی جینسی ترسناكترین تاقیكردنەوەی ئاینییە لە ژیانی ئادەمیزاددا ، لەبەر ئەوەی لە كاتێكدا كە سروشتی ئادەمی لە گوناهەكانی ترا یارمەتی لایەنی خوا پەرستی ئەداو حەز بەو گوناهانە ناكات ، لەم كاتەدا شان بەشانی ئارەزووی جینسی ئەوەستێو هەڵی ئەنێ ، یان بەلای كەمەوە ، ناتوانێ لەغاوی هەواو ئارەزوو بگرێ ، یان نەختێ لە هەڵچوونەكەی كەم كاتەوە •

هەر لەبەر ئەمەیشە كە چارەسەركردنی ئیسلام بۆ هەموو جۆرە گوناهێ ئەوەیە كە خۆمانی لێ دوور بگرینو بەچاوێكی سوك تەماشای بكەین • بەڵام چارەسەری ئارەزووی جینسی بەتایبەتی ئەوەیە مرۆڤ لێی پاراوبێتو ئارەزووی خۆی تێر بكا ، بەڵام لەسنوورێكی رەواو دیاری كراودا كە نابێ لێی لابدا •

هەر لەبەر ئەمەیش ووتمان : ئافرەت ترسناكترین تاقیكردنەوەیە لەژیانی پیاودا •

دوور نیه خوشکێك پرسیار بکاو بڵێ : ئەی بۆچی پیاویش نابێتە تاقیکردنەوەیەکی زۆر خەتەر لەژیانی ئافرەتدا ، لەکاتێکا کە هەستی جینسی لەهەردوکیاندا وەك یەك بەرپایە ، ئیتر هەردوو هاوشان ئەبن و وەك یەك بەرپرسیار ئەبن ؟! ..

لەوەلاما ئەڵێین لەبەر ئەوەی خوای گەورە ئافرەتی دروست کردووە لەسەر چەند بناغەیەکی دەروونی (حاسس نفسیة ) وای لێ کردووە داواکراو بێت زیاتر لەوەی داواکار بێت ، ئافرەت هەرکات هەستی بەئارەزوویەکی غەریزی کرد ، ئەو بناغە دەروونیە ڕەسەنانەی خوادایناوە تیایدا پاڵی پێوە ئەنێ بۆ ئەوەی زیاتر خۆی بپارێزێ و کەنارگیر بێ ، تا کارێکی وابکا پیاو ناچار بکا زیاتر هەوڵی بۆ بداو بەدوایا بگەڕێ ، لەبەر ئەمەیە ئافرەت تاقیکردنەوە ( فتنة ) یە بۆ پیاو زیاتر لەوەی پیاو تاقیکردنەوە بێت بۆ ئافرەت ، وەك پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لە فەرموودەیەکیا ئەم مەبەستەی ڕوون کردووەتەوەو ئەفەرموێ : ( ما تركت بعدي فتنة أضرّ على الرّجال من النّساء ) متفق عليه .

واتە : قورسترین و ترسناکترین فیتنەیەك کە دوای خۆم بەجێم هێشتبێ بۆ پیاو فیتنەی ئافرەتە(١) .

دوای ڕوون کردنەوەی ئەم ڕاستی یە پێویستە هەموو خوشکێك بزانێ کە گرانی و سوکی ئەم تاقیکردنەوەیە کە پیاو دووچاری بووە ، وابەدەس ئافرەتەوە .

ئافرەت ئەتوانێ خۆی بکاتە بەلایەکی کوشندە بۆ پیاو ، کە

---

(١) ( الفتنة ) لە زمانی عەرەبیدا بەمانا تاقیکردنەوە دێت ، نەك بە مانا دوو زمانی و فیتنەیی وەك لەکوردیدا باوە . ( وەرگێر ) .

نەتوانێ لێی دەرباز بێ ، وەئەیشتوانێ خۆی بکاتە پاڵپشتی پیاو ، بۆ ئەوەی بەرێگای بەختەوەریو سەرفەرازیدا بیبات •

چەندەها نەتەوەی خاوەن دەوڵەتو ڕێز هەبوون لەنێو گەلانا ، بەهۆی داوێن پیسیو بەد ڕەوشتی‌یەوە لەناوچوونو باسیان نەما ، وەهۆی سەرەکی ئەم تیاچوونەیش تەنها ئافرەت بوو !•• خۆ هەواڵی لەناوچوونی دەوڵەتی رۆمانو مەزدەکو شارستانی‌یەتی هیندی‌مان هێشتا بیر نەچۆتەوە •

لێرەوە ئەزانین کەگرنگترین فەرمانی ئیسلامی بەسەر شانی ئافرەتەوە ئەوەیە : شمشێری جوانیو لاشەی ڕووتیان لەئاستی پیاواندا بخەنە کێلان ، تانەیانخەنە ناڕەحەتیو هەناسە بڕکێ لەم تاقیکرنەوەیەدا•

پایەبەرزترین کردەوەی چاکی ئافرەت بۆ بەدەس هێنانی ڕەزامەندی خوا ئەوەیە کە هەوڵی یارمەتی‌دانی پیاو بدات بۆ دان‌بەخۆداگرتن لەرەوشتیاو پاراستنی‌هەواو ئارەزووی لە لادانو هەڵە کردن، لە هەمان کاتدا گەورەترین گوناهی ئافرەت ـ کە غەزەبی خوا بەسەریا بڕژێنی ـ ئەوەیە ببێتە هۆی لادانی پیاو لە ڕاستیو داوێن‌پاکیو چنگڵەچزێی ئارەزووی جینسی بدا •

ئەو فەرموودەی پێغەمبەریش ( صلى الله عليه وسلم ) کە ئەفەرموێ : زۆربەی ئەهلی دۆزەخ ئافرەتن لەبەر چەند هۆیەکە ، وەهۆی هەرەگەورەیان ئەوەیە کە ئافرەت لەم ئەرکە گەورەیەی کە خوا داویەتی بە سەریاندا ، ناترسنو فەرمانی خوا بەجێ ناهێنن •

* * *

ئەی خوشکی موسوڵمان خۆ تۆیش باش ئەزانی کە رۆژئاوا ـ بە هەردوو بەشی ئەوروپاو ئەمریکایەوە ـ بۆیە لەموسوڵمانان ئەترسن لەبەر ئەوەی ئیسلامن ! خەمخوارو پێشڕەوەکانی رۆژئاوا پاش لێکوڵینەوەیەکی تەواو زانیان کە خۆرێ راپەرینی ئەوروپا کاتێ بەسەریاندا هەڵهات ، کە خۆری حوکم کردن بە ئیسلام‌و تواناو دەسەڵاتی ئیسلام لەناو موسوڵماناندا ئاوابوو •

ئەگەر جیهانی ئیسلامی ئاوا لەتاریکایی نەفامی‌و دوور لە ئیسلامیدا نەژیایەین ، لە جیهانی ئەوروپادا رۆشنایی زانیاری‌و زانستی هەڵنەئەهات‌و کەڵکی لەم هەلە وەرنەئەگرت •

جا لەبەر ئەوەی ئەم راستی‌یە لەدڵی دوشمنانی ئیسلامدا جێگیر بووە ، بە هەموو تواناو دەسەڵاتیانەوە هەوڵ ئەدەن ، تا موسوڵمانان لە ئیسلامەکەیان دوور بخەنەوەو ویڵ‌و سەرگەردانیان بکەن لەمێژوویان‌و لەو سەرچاوەیەی کە چەندەها زانای بەرزو بلیمەتی موسوڵمانانی پێگەیاندو لێی پاراو بوونەوە ، وەهەوڵ ئەدەن بەهەر شێوەیە بێ ، وێڵیان بکەن لەناوەڕوك‌و حوکمی ئیسلام بۆ ئەوەی بەرهەمی راپەڕینەکەی خۆیان بپارێزن‌و بۆیان بەردەوام بێت •

وایش ئەزانم پێویست بەهیچ بەڵگەیەك نیە ئەم حەقیقەتەت بۆ روون بکاتەوە ؛ چونکە چەپەی سەرگەورەو رۆشن بیرەکانی رۆژئاوا لەم بارەوە لە هەموو شوێن‌و کون‌و قوژبنێکا ئەبیسرێ‌و هەستی پێ ئەکرێ ، بەڵکو تەنانەت چپەو نهێنی‌یەکان بوون بە بانگەوازێکی بەرزی وەها ، کە هەموو تێگەیشتوو رۆشنبیرێك ئەیبیسێ‌و لێی تێئەگا •

بەڵام هەر وای بەباش ئەزانم نموونەیەك لەم چپەی ژێر لێوە بخەمە

پێش چاوت ، کە لەم دوایی‌یەدا بوو بە دەنگێکی ئاشکراو دەرکەوت بۆ هەمو مروڤێکی ووریاو چاوکراوە •

بڕوانە ئەم چەند بڕگەیە لە پەڕاوی ( ئیسلام بۆ کوێ ڕووی ناوە Whiher Islam? ) کە کۆمەڵێ زۆر هەڵاتناسی رەگەز جیاواز دایان ناوەو راوێژکاری وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیز هـ ٠ ١ ٠ ر جیب کە یەکێکە لـە رۆژهەڵاتناسەکان ، کـۆی کردوەتەوەو پێشەکی بـۆ نوسیوەو لێی کۆلیوەتەوە •

جیب پێشەکی‌یەکی درێژی بۆ ئـەم پەڕاوە نوسیوە لـە قەوارەی سەد لاپەڕەدا ، تیایدا ئەڵێ :

جیاکردنەوەی سنوور لەنێو ولاتە ئیسلامی‌یە جیاجیاکاندا نەیتوانی کار بکاتـە سـەر یـەکێتی شارستانی‌یەتی ئیسلامی‌و زەرەری لێبدا ، بەدرێژایی مێژووی ئەم شارستانی‌یەتەو بەپان‌و پۆڕی ئەم جیهانە ئیسلامی‌یە بەرپانـە ، بەشێوەیـەك جیهـانی ئیسلامی بوودتـە جیهانێکی ... یەکگرتووی راماری‌و ، گەمارۆی ئەو ... جیهانی بچڕیوە •

پاشان روونی ئەکاتەوە کـە چـۆن رۆژئاوا توانی ئـەم گەمارۆیە پەرتەوازە بکاو ، شارستانی‌یەتی ئیسلام تێك‌وپێك بداو تەفروتونای بکا • لەدوای ئەمە ئەڵێ : ( ئابەم شێوەیە فەمارمانەکانی ئایین‌و یاساکانی رەوشتی ئیسلامی لەنێو موسوڵماناندا بەرەو گۆڕان ئـەڕۆن ، وەئەم گۆڕانەیش وورده وورده لەخوو رەوشتی رۆژئاوایان نزیك ئەخاتەوە ، کە ئەو خوو رەوشتەیش لـەهەمان کاتدا بریتیـە لـەدیاردە رەوشتیەکانی کڵیسـای گاوریتی •

لەپاشا جیب ئـەڵێ : گەشە کردنی زانستی‌و رۆشنبیری لەرێگای

رۆژنامەو قوتابخانـەکانەوە کارێکی وای کردووە بـەموسوڵمانان ـ بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن ـ کـە لەرواڵەتی گشتیاندا لـە بێدین بچن تا رادەیەکی زۆر • لەپاش ئەمە ئـەڵێ : ( ئـەمە بەتایبەتی تاقـە ئەمامێکە هاتێتە بەرهەم لەهەموو ئەو هەوڵو تەقالایەی ئەوروپای رۆژ ئاوا داویەتی بۆ ئەوەی جیهانی ئیسلامی بخاتە سەر شارستانی‌یەتەکەی خۆی ) •

لـەدوای ئـەمـە جیب بەهەموو پێخۆشحاڵیەکەوە دانی‌پیائـەنێو ئـەڵێ : ( جیهانی ئیسلامی لەماوەیەکی کەمدا ئەبێتە جیهانێکی بێ‌ئایین لەهەموو رواڵەتەکانی ژیانیدا بەمەرجێك ، ئەم شێوازەی ژیانیان گۆڕانی بەسەردا نەیەت بەچەند کارەساتێك کە بەنیازو ئەقڵماندا نەیەتو حیسابیان بۆ نەکرابێ •

بەڵام لەم قسەیە پاش‌گەز ئەبێتەوەو ترسی خۆی دەرئەبڕێ لەوەی کە لەوانەیە سەرلەنوێ ئیسلام سەربەرزکاتەوەو بەرهەمی هەوڵی چەند ساڵەی رۆژئاوا بـەتاڵ کاتـەوە ، بۆیـە ئـەڵێ : ( بـەڵام بزووتنەوە ئیسلامی‌یەکان بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر پەرە ئەسەنێو گەشە ئەکەن ئـەو بزووتنەوانە بەتەقینەوەیەکی کوتوپڕ ئـەتەقێنەوە تەنانـەت پێش ئـەوەی چاودێری کەران ( المراقبون ) نیشانـەکانی ببینێو لێی بکەونە گومان ، بزووتنەوە ئیسلامی‌یەکان هیـچ ناتەواویەکیان نیە جگە لەسـەر کردایەتی ، هیچ کەمو کوڕیەکیان نیە تەنها دەرکەوتنی (صلاح‌الدین)ێکی تازە نەبێ[1] •

ئایا ئـەو چەکـەی رۆژئاوا خستی‌یە کار بۆ پـەرتەوازەکردنی

---

(١) بروانـە پەراوی : ئیسلام بۆ کوێ رووی ناوە • وەبڕوانە بەرگی دووهەم پەڕاوی ( الاتجاهات الوطنية في الادب المعاصر ، د• محمد محمد حسين ، ل : ١٩٧ ـ ٢١٣ •

شارستانی‌یەتی ئیسلامو لابردنی ڕەوشتی جوانی ئیسلامی لەژیانی موسوڵمانانو هەڵسو کەوتیانا چی بوو ؟

بەکارترین چەك کە ڕۆژئاوا بەکاری هێنا بۆ وەدەس هێنانی ئەم مەبەستە ئافرەت بوو •

چونکە ئەوان ئەیانزانی ـ وەك ئەمڕۆ ئێمە ئەیزانین ـ کە پڕوپاگەندە ناتوانێ کاریکاتە سەر ئەقڵی موسوڵمانان بەقەدەر دەیەکی ئەوەی بزواندنی جینسی کاریان تێ ئەکات ، وەئەگەر گومانو شوبهەی بیرو باوەڕیشیان بۆ بخرێتە کار ئەبێ پاشو پێشی ئەم گومانانە بەچەند هەڵنانو پیلانێکی جینسی بگیرێ کە ئافرەتی بۆ بکرێتە سەربازو تێکۆشەر •

هەر لەبەر ئەمەیشە کە جەنگی بیروباوەڕی ( الغزو الفکری ) هەرچەند ڕواڵەتەکانی جیاوازبن ، لەسەر یەك بناغەی گرنگ ڕائەوەستێ کە هیچ شتێکی تر لەشوێنیدا دانانیشێ کە ئەویش ئافرەتە ، بەهەر شێوەیەك کە بتوانن هەڵی خەڵەتێننو تەفرەی دەن کە خۆی بڕازێنێتەوەو پیاو گیرۆدەی جوانیو نازداریی خۆی بکا ، وەهەروەها بەهەموو شێوەیەك هەوڵ ئەدەن لەچاودێریی خێزانو منداڵداری دووری بخەنەوە •

بەڕای من پێویستمان بە بەڵگە نیەبۆ دەربڕینی ئەم ڕاستی‌یە چونکە ـ وەك وتمان ـ ئەو بەڵگانە ئاشکرانو هەرکەسێ توزێ شارەزای ئەم چەرخەبێ ئەیانزانێ •

لەگەڵ ئەوەیشدا باوەك نموونەیەك ئەم ووتەیەی قەشەی ڕۆژهەڵاتناس ( جسب ) بخەمە پێشچاوت کە ئەڵێ :

( قوتابخانەی کچان لەوڵاتانی عەرەبیدا بیلبیلەی چاوی منن ، هەمیشە واهەست ئەکەم کە باشە ڕۆژی ئێمە لەسوریا بەفێر کردنی کچانو

ژنانیانه • هەوڵو تەقالای ئێمە لەم لایەنەوە بەبێ هێزی دەستی پێ کرد ، بەڵام وائەمڕۆ کۆمەڵگاکانی بلاو کردنەوەی گاورێتی ( الجمعیات التبشیریة ) زۆر چاویان تێ بڕیوەو بایەخی پێ ئەدەن[1] •

باو ڕ ناکەم بەوەی هەرئینسانێ خوا پاراستبێتی لەشێتی بتوانێ بڵێ : ( قوتابخانەی کچان بۆیە بیلبیلەی چاوی ( جسب )ە چونکە ئەو حەز بەبەرژەوەندی وڵاتانی ئیسلامی یان عەرەبی ئەکات ، وەزۆری پێ خۆشە ئەم وڵاتانە تووشی چاکە بن •

بۆیە ئەم قوتابخانانە بیلبیلەی چاوی ئەون ، چونکە ئەزانێ ئافرەت تا چ رادەیەك کاریگەرە لەراستکردنەوەو ریکوپێك کردنی ، یان فەوتاندنو لەناو بردنی ژیانی کۆمەڵدا ، کەوابوو پێویستە پشت بەقوتابخانەی کچان ببەستن ، هەتا بتوانرێ لەوێوە پەروەردە بکرێنو دەسکێش بکرێن بەگوێرەی نیازو خواستی خۆیان •

* * *

بەڵام ئایە چۆن سەرۆکەکانی جەنگی بیروباوەڕی توانیان لە ڕێگای ئافرەتەوە بگەن بەو ئاواتەی ئەیانویستو ، تا ئێستەیش ئەیانەوێ پێی بگەن ؟! •

ئەوان رێگایەکیان گرتەبەر دەربارەی ئافرەت کە لەهەموو شتێکا بە تەواوی پێچەوانەی فەرمانەکانی ئیسلام بوو !

ئەوەی ئیسلام فەرمانی پێ کردووە دەربارەی ئافرەت کە ئەوەیە ئەبێ داپۆشراوو پارێزراو بێتو جوانی خۆی لە بەردەم پیاوانا دەرنەخات • کەچی ئەمان هەوڵیان ئەدا ئافرەت رووت کەنەوە لەحیجابو خۆپاراستن ،

---

(١) بروانە : التبشیر والاستعمار ، مصطفی الخالدي وە عمر فروخ ، ل : ٨٧ •

وەهەڵی بنێن بۆ ئەوەی لە جۆرەها جێگەو بازاڕو کۆمەڵگاکاندا بەرووتی بگەڕێ • وەبۆ بەجێهێانی ئەم ئامانجە پشتیان بەو بەناوموسوڵمانە دووڕوانە بەست کە هەمیشە ئامادەن بۆ گۆڕاندنی فەرمانەکانی خوا بۆ گەیشتن بە رابواردنێکی کەمی ئەم ژیانی دنیا •

ئەوەی ئیسلام فەرمانی پێداوە کە ئافرەت بەڕووتی نەگەڕێو خۆی لەبەردەم بێگانەدا دەرنەخا وەك چەرخی نەفامیو خۆی لەماڵەوە بگرێو بەوپەڕی توانایەوە بنەماڵەو خێزانێکی رێكوپێك پەروەردە بکا • کەچی ئەوان تێ ئەکۆشان کێچ بکەنە کەوڵی ئافرەتەوە ، تا لەماڵدا ئۆقرە نەگرێو لەفورسایی کاروباری ژیاندا هاوبەشی پیاو بێت ، بۆ ئەوەی نەتوانێ بیر لەماڵو منالی بکاتەوە • وەتوانیان لاوازیو کەمدەستی موسوڵمانەکان لەلایەنی پیشەسازییەوە بکەن بەدارددەستی خۆیان ، بەم رەنگە بلاویان کردەوە کە هۆی دواکەوتنی موسوڵمانان لە کاروانی پێشکەوتنی گەلان ئەوەیە کە موسوڵمانان لاوازن لەمەیدانی پیشەسازیدا • خۆ پیشەسازیش بەدەستی گەل نەبێ پێك نایەت ، بەو مانایەی تا دەستی کرێکارو هەوڵدان زیاتر بێت زیاتر کاروانی پێشکەوتن بەردوپێش ئەڕوا ، ئەمەیش بەوە ئەبێت ئافرەت بەشداری پیاو بکا لە ئیشکردندا وەك جیهانی رۆژئاوا ، چونکە وەستانی ئافرەت مانای وەستانی نیوەی کۆمەڵە وەك لە جیهانی ئیسلامیدا باوە[1] •

---

(١) لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو هەر ئەوانەی بەم بیانووەوە خەوو خۆراکیان لەئافرەت تاڵ کردبوو بۆ ئەوەی بیخەنە ناو کۆڕی ئیش کردنەوەو لە پەروەردەی منالی ببرن ، لە لایەکی ترەوە جۆرەها داوو دەرمانو حەبیان خستە کار ، بۆ قەلاچۆ کردنو لە ناوبردنی نەوەی داهاتوو ، بە بیانووی ئەوەوە کە گوایە ژمارەی ئادەمیزاد

ئەم فرپوفێڵە هەرچەند ئەمڕۆ کۆن بووە ، بەڵام لە مێشکی هەندێ لاوو بەناو رۆشنبیرەکانی ئێمەدا جێی خۆی کردووەتەوە بە شێوەیەك وائەزانن راستە کە هۆی دواکەوتنی موسولمانان تەنها ئەم جل‌و بەرگەیە کە ئافرەتی موسولمان لاشەو رووەمەتی خۆی پێ داپۆشیوە ، وەهەرکات ئیمان ژمارەی دەستی کارا دووچەندانە بکەینەوە بە هاوبەشی ئافرەت لەگەڵ پیاودا ، مانای وایە ئەو کاتە گەیشتووین بەکاروانی پێشکەوتن‌و شارستانی‌یەتی تازە وەك گەلە پێشکەوتووەکان .

جا کەوابوو ئێتر بوت‌و وێز کردن دەربارەی ڕای ئیسلام لە جل‌وبەرگی ئافرەت‌و هاوبەشی کردنی ئافرەت لەکارکردن‌و خوێندنا جێگای گاڵتە پێکردن‌و لاقرتی‌یە ، هەتا وای لێ‌هات کەبڵێن : ئیسلام بووەتە هۆی دواکەوتنی موسولمانان‌و رێگرتنیان لەوەی بەرەو پێشکەوتن هەنگاو هەڵێنن .

لەمەیش نەگبەتی‌تر ئەوەبوو کە لەدەوروبەری ئەمانەدا چەند کەسێ کەوتنە جم‌وجوڵ بۆ یاری کردن بەدەقەکانی یاسای ئیسلام ، لەبەر بەرژەوەندیەکی دنیایی خۆیان یان لەبەر پاراستنی پلەو پایەیان ، خۆ دەقەکانی یاسای ئیسلامیش ، وەك یاساکانی‌تر پێکهاتووە لەووشە ، کە وابوو هەروەك چۆن پارێزەرێك ( المحامی ) لەبەر وەدەس هێنانی ئەندازەیەکی دیاری کراو لەماڵ‌و سامان یاری بەبابەتەکانی یاسا ئەکاو بەئارەزووی خۆی تەئویلی ئەکا ، هەروەها ئەو زانایەیش کە لەقارو

---

زۆر زۆر بووە ئەگەر هەروا لەزیادبوونا بێت مرۆڤایەتی تیا ئەچێ‌و بەرهەمی زەوی بەش ناکات‌و وای لێ‌دێ مرۆڤ مرۆڤ بخوات ! .
( وەرگێڕ ) .

عەزەبی خوا ناترسێو سڵ لەنافەرمانی ئەو ناکا ، بە باشی ئەتوانێ دەقەکانی شەرع بەگوێرەی مەبەستی خۆی تەئویل بکاو یاری بەووشەو مانا بکا •

بێگومان لەبەرهەمی ئەم نەگبەتی‌یەدا شالاوی شەڕ پەرەی سەندو بوو بەهۆی گومرابوونی زۆر لەموسوڵمانانو ، وەبەهۆی فەتوای ئەم فێڵبازانەوە لەرێگای خـوا لایان‌داو لەجادەی راستی وێلبوون بـەهۆی چاولێکردنی مامۆستاکانیانەوە ، بەگومانی خۆیان وایان ئەزانی بەرەو خوا ئەیانبەن بەلام بۆ نەگبەتی‌و سزای پاشەرۆژ رێنومایی‌یان کردن •

★ ★ ★

ئەمە کورتەی دژوارەکەیە ئەم سەرەتاوە خستمە پێش‌چاوت ، بەو بیازە رێگایەکی ڕەوان بگرینە بەر بۆ چارەسەر کردنی •

رێگای رەوانیش ئـەوەیە کـە فـەرمانی خـوا ئاشـکرا بکـەین لەجل‌وبەرگی ئافرەت‌و کاری ئافرەت‌و فێرکرنی ئافرەتدا ، بێ ئەوەی تێکەلاوی بکەین بەهیچ زیادەیەك یان گۆڕاندنو یاری پێ کردنێك ، خۆ ـ وەك وتمان ـ ئێمە لـەم نامیلکەیـەدا رووی دەممان لـەو کیژۆڵەیە موسوڵمان بێ‌و باوەڕی بەخوا هەبێ ، وەئەم کەسەیش تەنهـا ئـەوەی پیویستە فەرمانو حوکمەکانی خـوای بەجـوانی‌و رێك‌وپێکی بخرێتـە پێش‌چاو •

پاش ئـەوەی لـەم مەبەستە بووینەوە هـەموو ئەودژوارو سنوورە دەسکردانەی کە لەرێگای بەجێ هێنانی ئەم فەرمانە گرنگەدا دانراون ئەیانخەینە روو •

ئایا راستە ئەم شتانە گیروگرفتن ؟ ئایا جێ‌بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا ئەبێتە هۆی دواکەوتنمان لەکاروانی پێشکەوتن‌و سەرکەوتنمان بۆ

کۆشکی شارستانی‌یەت‌و زانیاری ؟• پشت بەخوا لەمەولا ئەم باسانە بێ لایەنگیری هیچ رایەك چارەسەر ئەکەین ، هەتا بەتەواوی راستی بخەینە پێشچاوو هیچ درك‌و داڵێ لەرێگای دۆزینەوەو وەرگرتنیدا نەمێنێ •

خۆ دوای ئەوەی فەرمانی خوامان زانی زۆر لەبارو بەجێیە ئەگەر بمانەوێ بەرهەمی جێ‌بەجێ کردنی ئەو فەرمانانە بزانین ، ئایا زەرەری بووە یان قازانج ؟ چونکە کە بۆمان دەرکەوت قازانجی هەبووە ، ئەوە باوەڕو یەقینمان پێی پتەوو بەهێزتر ئەبێت • خۆ دەرکەوتنی زەرەریش – وافەرزکەین – مانای وایە رێگامان بۆ ئەکاتەوە بۆ پێداچوونەوەو ئیجتهاد کردن لەو شتەدا ، چونکە ناگونجێ فەرمانی خوا هیچ زەرەرو خراپەیەکی لێ بوەشێتەوە ، وە لەبناغەو بنەڕەتەکانی یاسای ئیسلامە فەرموودەکەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) : « لا ضرر ولا ضرار » •

داوایشم لەهەموو خوشکێکی موسوڵمان وایە کە بەبیرو هۆشێکی کراوەو عەقڵێکی سەربەستەوە لە چاولێکەری ئەم‌و ئەوو جلەوکێشی ئارەزووەکانی نەفس ؛ پێشوازی قسەکانم بکەن ، تا راستی بدۆزینەوەو وێڵ نەبین •

لە خوایش ئەپارێمەوە پارێزراومان کات لە خراپەی نەفس‌و فێڵ‌و تەڵەکەی شەیتان ، وەرێنمایمان بکات بۆ بەکار هێنانی ئەقڵ‌و هۆشمان وەدەرگای خێرو چاکە لەنێوان ئێمەو موسوڵمانانندا بکاتەوەو راستیمان نیشان بدا هەر خوا باشترین رێ پیشاندەرە[١] •

★ ★ ★

---

(١) لێرەدا پێویستە خوێنەر ئاگادار بکەم ، کە ئەم نامیلکەیە بەرپەرچە بۆ باسێکی أحمد حسن الباقوري ، کە لەژمارە ١٦٢ی سالی ١٩٧٢ی گوڤاری العربی ) دا بلاوی کردوەتەوەو تیایدا داوای تیکلاوی کردوەو مامۆستا ( بوطی )و چەند کەسێکی‌تر بەرپەرچیان داوەتەوە بەچەند نامیلکەیەك • ( وەرگێر ) •

# ئەمەیە حوكمی ئیسلام

پەنا ئەگرم بەخوا لەوەی كە بەشتێك بڵێم حوكمی ئیسلام‌و ئەچی هەندێ لەبیرو رای خۆم یائارەزووی نەفسی خۆمی تێكەڵاو بكەم • پەنا ئـەگرم بـەخوا لەوەی راستی‌یەك لـەو خەڵكە بشارمەوە یان قسەیەك برازێنمەوەو رووكەشی بكەم كـە لای خوا رەوا نیەو ئەو پێی رازی نی‌یە ! •

◂ نووسەر هەركات بیەوێ بەئاسانی ئەتوانێ ئەو ناهەقەی نەفسی خۆی حەزی پێ ئەكا تێكەڵاوی بكا بەو هەقەی خوا فەرمانی پێداوە ، بەڵام ئەمە تەنها لەئادەمیزاد یان هەندێكی كەم لەئادەمیزاد دەشارێتەوە ، بەڵام لای خوا ـ كە هیچی لێ ون نابێ ـ هیچ گۆڕانێك بەسەر راستیدا نایەت ، وەئەوەی خاوەن قەڵەم بەدەستی بێنێ لەفەتوای ناڕەواو سەرلێشێواندنی موسوڵمانانەوە ، تەنها هەڵگرتنی تاوان‌و ئۆباڵی ئەوانیشە كە دوای فەتوای ناهەقی ئەو كەوتوون •

نووسەری موسوڵمان پێویستی بەوە نیە مل كەچ بكات بۆ هەڵگرتن‌و چوونە ژێر باری تاوانی ئەم‌و ئەوەوە ، تا لەقیامەتدا تووشی سزاو عەزابی تاوانی ئەوانیش بێت‌و بچێتـە رێزی ئـەو تاقمەی رێگا لەئادەمیزاد وێڵ ئەكەن‌و لەراستی لایان ئەدەن ، هەتا لەرۆژی مەحشەردا كۆئەبنەوە ئەو كاتە دوا كەوتەكان تاوانی هەرەگەورەی مامۆستاكانیان بۆ دەرئەكەوێ‌و روو ئەكەنە خواو ئەپارێنـەوە : « ربنـا انـا أطعنـا سـادتنا وكبرائنـا فأضلونا السبيلا • ربنـا آتهـم ضعفين من العـذاب والعنهم لعنـاً كبيراً »

ئەی خوایە ! ئێمە بەقسەی گەورەو مامۆستاکانمان کردو دوای ئەوان کەوتین ئەوانیش رێگایان لێ وێڵ کردین‌و لەراستی لایان داین ٠

ئەی خوایە ! دووقات سزای ئەوانە بدە ، چونکە خۆیان وێڵ‌بوون‌و بەوەشەوە نەوەستان تا ئێمەیشیان لەرێگا لاداو سەرگەردانیان کردین ٠ ساخوا لەعنەت‌و غەزەبێکی بێ شومار برژێنە بەسەریاندا ٠

ئەمجارەیش پەنا ئەگرمەوە بەخوا لەوەی فێڵ لەو خەڵکە بکەم‌و وایان تێ‌بگەیەنم کە گوایە من حوکمی ئیسلامیان بۆ روون ئەکەمەوە دەربارەی ئافرەت ، بەڵام هەڵیان خلیسکێنم بۆ رێگای ئارەزوویەك لەئارەزووەکانی نەفس ، یان مەبەستێ لەمەبەستەکانی دنیا ، هەتا سبەی رۆژ لەبەردەم دادگای پەروەردگارا باوەشم پیاکەن‌و لەخوا بپارێنەوە دووچەندانە سزام بدات‌و نەفرینم لێ بکات ٠

# ڕوداوی تایبەتی نابێتە سەرچاوەی

# هیچ حوکمێکی شەرعی

حوکمی ئیسلام وەرئەگیرێ لەقورئانو حەدیثەکانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) یان لە قیاس بۆسەر ئەم دوو سەرچاوەیە ، یان لەرایەك کۆمەڵی زانایانو موجتەهیدەکان بڕیاریان لەسەری دابێت کەوابوو هەڵس و کەوتی تەنیا کەسێك ، یان ئەوەی زانایانی ئوصول ناویان بردوە بە ( وقائع الاحوال )[1] نابێتە بناغەو بەڵگە بۆ هیچ حوکمێکی شەرعی ، جا ئەم تەنیا کەسە لەیارانی پێغەمبەر بێت یان لەوانە بێت دوای ئەوان هاتوون ( التابعین ) یان هەرکەسێکی تربێت ، بەڵکو رای هەموو موسولمانان لەسەر ئەوەیە کردەوەی ئەوانیش بەتەرازووی ئیسلام پێوانە ئەکرێ ، نەك حوکمی ئیسلام بەکردەوەو بەسەرهاتی ئەوان پێوانە بکرێ •

خۆ ئەگەر کرداری تاقەیەکێك لەیارانی پێغەمبەر ، یان لە ( تابعین ) ببوایە بە بەڵگە لەسەر حوکمی شەرعی بێ پێویستی بوون بەهیچ بەڵگەیەکی

---

(١) ( وقائع الاحوال ) بریتیە لە چەند هەڵویستێکی تەنیا کەسانێ کە لەزەمانی یاسادانانەدا ( التشریع ) رووی داوە ، بە پێچەوانەی بەڵگە گشتییەکانەوە ( أدلة العموم ) ، وەك ئەوەی کاتی ( أبو برده ) ویستی قوربانی بکا بە کارە مێچکەیەك پێغەمبەر فەرمووی : بۆ تۆ درووستە دوای تۆ بۆ کەس درووست نیە • بڕوانە : ( الاحکام ، للآمدی ٢/٧٠ ، والموافقات للشاطبی : ٣/٢٦٠ والمستصفی للغزالی ٢/٦٨ ) •

تر ، ئەبوایە ئــەوان شایانی هــەڵەو گوناهـ نەبوونایە ، وەئەبوایە وەك پێغەمبەری خوا ( صلی الله علیه وسلم ) بێ گوناه ( معصوم ) بوونایە ، خۆ ئاشكرایشە تەنها پێغەمبەران مەعصومو بێ‌تاوانن ، جگە لەوان هەمووكەس شایانی هەڵەو تاوانە ، وەك پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) ئەفەرموێ : ( كل بني آدم خطاء وخير الخطائين التوابون )[1] هــەموو ئادەمیزاد گوناهبارن ، وەباشترین گوناهبار ئــەوەیە زۆر هاواربەرێ بۆ تــەوبەو پەشیمان بوونەوە ٠

جار كەوابوو باشترین رێگە بۆزانینی حوكمی خوای گەورە لەباسی ئافرەتدا ئەوەیە بۆلای قورئانو حەدیثو بگەڕێینەوە ، وەهەركاتێ هاتینە سەر ئەم بڕیارەو بەگوێرەی تێگەیشتنی پێشەواو زانایان فەرمانی خوامان وەرگــرت ، مانای وایــە ئــەوە حوكمی خوایــەو قابیــل بــەگۆڕانو هەڵوەشاندنەوە نیە ، هەرچەند هەندێ كەس بەپێچەوانەی ئەم فەرمانانەوە بجوڵێنەوە ، ئیتر كەیفی خۆیانە ئەوانە لەهەر چینو تاقمێك بن ٠

---

(١) بڕوانــە : التــاج الجــامع للأصــول ، ب : ٥ ، باب التوبــة ٠ ( وەرگێڕ ) ٠

## هەموو لاشەی ئافرەت عەورەتەو حەرامە

## دەرخستنی جگە لەرووومەتو دەست

ئافرەتی عەرەبی لەچەرخی نەفامیدا هەوڵی ئەدا هەموو جوانی‌یەکی لەبەردەم پیاواندا دەربخات ، بەڵام زۆر لەم بارەوە خۆی نەئەڕازاندەوە وەك ئافرەتی گەلەکانی‌تر •

ملو گەردنو هەمووقژی ئافرەت ئاشکراترین ئەندامی بوو نەیڕازاندەوە لەبەردەم پیاواندا •

کە ئیسلام هاتوو فەرمانەکانی یەك لەدوای یەك دامەزرا ، دەربارەی ئافرەت ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتە خوارەوە : ( يا أيها النبي قل لأزواجك وبناتك ونساء المؤمنين يدنين عليهن من جلابيبهن ، ذلك أدنى ان يعرفن فلا يؤذين وكان الله غفورا رحيما ) •

واتە : ئەی پێغەمبەر فەرمان بدە خێزانەکانتو کچەکانتو هەموو ئافرەتانی موسوڵمانان چارشێوو سەرپۆشەکانیان نزیك بکەنەوە لەسەرو گەردنیانو پۆشاکی تەواو لەبەرکەن بۆ ئەوەی بناسرێنو بێ‌ئابڕوو شەلاتی‌یەکان بزانن ئەوانن کێن ، تاڵیان دووربکەونەوەو لاکوڵانیان لێ نەگرنو ئازاریان نەدەن • وەخوا تاوانبەخشو میهرەبانە •

هەروەها دەرهەق ئافرەت ئەم ئایەتەیش هاتە خوارەوە : ( وقل للمؤمنات : يغضضن من أبصارهن ، ويحفظن فروجهن ، ولا يبدين زينتهن الا ما ظهر منها ، وليضربن بخمرهن على جيوبهن ، ولا يبدين

زينتهن الا لبعولتهن ، او آبائهن ، او آباء بعولتهن ، او ابنائهن ، او ابناء بعولتهن ، او اخونهن ، او بني اخوانهن ، او بني اخواتهن او نسائهن او ما ملكت ايمانهن او التابعين غير اولى الاربة من الرجال ، او الطفل الذين لم يظهرو على عورات النساء ولا يضربن بأرجلهن ليعلم ما يخفين من زينتهن ، وتوبوا الى الله جميعا ايها المؤمنون لعلكم تفلحون ) •

ئـەی موحەمەد فەرمان بدە بەئافرەتانی خاوەن باوەڕ ؟ باچاویان لەراستی حەرامدا داخەنو ، خۆیان لەزیناو داوێن پیسی بپارێزن لاشەو جوانی خۆیان دەرنەخەن بێجگە لـەوەی بەناچاری دەرئەکەوێ ـ وەك ئەمەودوا بەدرێژی باسی ئەکەین ـ وە باســەرپۆشەکانیان بدەن بەســەر سینگ‌و بەرۆکیانداو جوانی خۆیان نەنوێنن‌و لاشەیان دەرنەخەن تەنها بۆ مێردەکانیان‌و ، ئەو مەحرەمانە نەبێ ئایەتەکە یەك یەك باسی کردوون •

هەروەها دەربارەی خێزانەکانی پێغەمبەر ئەم ئایەتە هاتەخوارەوە کەئەفەرموێ : « وقــرن في بيوتكن ولا تبرجن تبرج الجاهليــة الاولى ، واقمن الصلاة وآتين الزكاة واطعن الله وسوله ، انما يريد الله ليذهب عنكم الرجس أهل البيت ويطهركم تطهيرا » •

لەماڵەکانی خوتانا خۆتان بگرن‌و بێ پێویستی مەچنە دەرەوەو خۆتان رووت مەکەنەوە وەك خۆرووت‌کردنەوەی چەرخی نەفامی پێشوو ، نوێژ بەجێ بهێنن‌و زەکات بدەن‌و گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەری خوا بکەن • خوای گەورە ئەیەوێ گوناهو تاوانتان لەسەر لابەرێ‌و پاك‌و خاوێنتان بکات ئەی ئەهل‌وبەیتی پێغەمبەر !•

لای هەموو خوشکێك روونە کە ئەم فەرمایشتانە هەموو ئافرەتێك ئەگرێتەوەو ، تایبەتی نیە بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بەڵام بۆیــە ڕووبەڕووی ئـەوان وتراوە لەبــەر رێزلێ‌گرتنیان‌و لەبەر

ئەوەیش ئەوان ئەبێ پێش هەمووکەس ملکەچی ئەم فەرمانانەبن •

جابۆیە زانایانی ئیسلام رایان لەسەر ئەوەیە کە هەموو لاشەی ئافرەت ، روومەتو دەستی نەبێ ، واجبە داپۆشرێ ، چونکە ئەو شوێنە بەدەرەوە بوانەی ناڕەحەتە داپۆشینیان لە روومەتو دەست بەدەر نیە ، بەڵام بەمەرجێ کە ئەو شوێنانەیش بەشێوەیەکی سروشتی بێتو هیچ داوودەرمانی بۆ نەخرابێتەکار •• وە بەگوێرەی فەرمانی خوا جگە لەم شوێنە بەدەرەوەبوانە ( ما ظهر منها ) واجبە هەموو گیانی ئافرەت وەك گەردنو لاملو قژ •• داپۆشرێ • تا ئێرە جیاوازی لەنێوان هەموو زانایانی ئیسلامدا نیە لەهەموو چەرخێکدا • بەڵام دەربارەی روومەت پۆشین لێکۆڵینەوەکیان هەیەو زانایان تیایدا بوون بەدوو بەشەوە ، واپێشت بەخوا باسی رای هەردولایان ئەکەین لەگەڵ بەڵگەکانیاندا •

## لێ کۆڵینەوەی زانایان لەرووومەتی ئافرەتدا

دەرکـەوتنی رووومەتی ئافرەتو پەچـە نەپۆشین لـەنێو زانایاندا بووەتە جێگای گفتو گۆو جیاوازی ، وەلەم بارەوە بوون بەدوو تاقم :

تاقمی یەکەم : ( ما ظهر منهـا ) لـە ئایەتی رابوردوودا تەفسیر ئەکەن بەجوانی جلو بەرگو سەری پەنجەکانو ئەوەی لـە گەڵیاندا دەرئەکەوێت ، وەك مستیلە • کە وابوو رووومەتو دەست لەوشوێنانەن حەرامە دەرخستنیان لەسەر ئەم رایە دروست نیە بۆ ئافرەت رووومەتو دەستیشی دەربخات مەگەر لای ئـەو خزمانەدا کـە خوای گەورە لـە ئایەتەکەدا ناوی بردوونو جیای کردوونەوە •

خاوەنانی ئـەم رایە کـە شوێنکەوتوانی ئیمامی ئەحمەدو هەندێ لەشافیعی مەزهەبەکانن پشت بەم بەڵگانەی خوارەوە ئەبەستن :

١ ـ ئایەتی « واذا سألتموهنَّ متاعاً فاسئلوهنَّ من وراء حجاب » ئەم ئایەتە هەرچەند دەرهەق بەخێزانەکانی پێغـەمبەر نازڵ بووە ، بـەڵام حوکمەکەی تایبەتی نیە بەوانەوە ، چونکە هۆی ئەو حوکمە لەهەموو ئافرەتێکدا هەیە • کـە وابوو جیاوازی لەنێوان ئەوانو ئافرەتانی تردا نیـەو حوکمەکە بـۆ هەموو ئافرەتێ دامەزراوە ، چونکە ئەگەر خـوا دەربارەی خێزانەکانی پێغەمبەر ئەم فەرمانەمان پێ بدا ، کە ئەوان دایکی موسوڵمانانیشن ئەبێ دەربارەی ئافرەتانی تر چۆن ئـەم فەرمانەمان پێ نـەدا م؟!

٢ ـ ئەو حەدیثەی ئیمامی بوخاری لەحەزرەتی عائیشەوە ( رەزای خـوای لێ بێت ) ریوایەتی کردوە لـە باسی جـلو بـەرگی حاجی ئیحرامپۆشدا : ( لا تلثـم المـرأة ولا تبرقع ولا تلبس ثوباً بورس ولا زعفران ) ئافرەتی ئیحرامپۆش دەمو لووتو رووەمەتی داناپۆشێو بەرگی بۆن خۆشکراو لەبەر ناکات • هەروەها ئەو حەدیثەی ئیمامی مالیك لە ( موطأ ) دا ریوایەتی کردوە لە نافیعەوە کە ( عبداللّەی کوڕی عمر ) ئەیفەرموو : ( لا تنتقب المـرأة المحـرمة ولا تلبس القفـازین ) ئافرەتی ئیحرامپۆش رووەتی داناپۆشیو دەسکێش لە دەس ناکا • ئەگەر لەسەر ئافرەت واجب نەبوایە لە دەرەوەی ئیحرامدا دەستو رووەمەت داپۆشێ ؟ بۆچی ئەم فەرموودانە داوای لێ ئەکـەن لەکاتی ئیحرامدا ئەم شوێنانـە دەربخات ؟ •

٣ ـ ئەو حەدیثەی بوخاری ریوایەتی کردوە لە ( عبداللّەی کوڕی عباس )ەوە کەرۆژێك لە رۆژەکانی حەج کەپێی ئەوترێ ( یوم النحر ) پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) فەضلی کوڕی عەباسی لەدوای خۆیەوە سواریوڵاخێ کردبوو لەرێگادا ئافرەتێك وەستاو پرسیارێکی لە پێغەمبەر کرد ، لەم کاتەدا فەضل تەماشای ئافرەتەکەی کرد پێغەمبەر ) صلی الله عیه وسلم ) ڕووی فەضلی وەرگێڕا لـە ئافرەتەکەو نەیهێشت تـەماشای بکا • جا ئـەگەر رووەمەتی ئافرەت عـەورەت نەبوایەو حەرام نەبوایـە تەماشاکردنی ؟ پێغـەمبەر ( صلی الله علیـه وسلم ) رووی فـەضلی لێ وەنەئەگێڕا • وەئەو ئافرەتە بۆیـە رووەمەتی بـە دەرەوە بوو چونکـە لەئیحرامدا بوو •

٤ ـ ئەو حەدیثەی کە موسلیم ریوایەتی کردووە لە عوقبەی کوڕی عامیرەوە ( رەزای خوای لێ بێت ) کە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم )

فەرموویەتی : ( اياكم والدخول على النّساء فقال رجل من الانصار : يا رسول الله افرأيت الحمو ؟ قال : الحمو الموت ) • دەخیلتان بم لەگەڵ ئافرەتی بێگانـەدا دامەنیشن • پیـاوێ لـە یاریدەدەرەکان ( الانصار ) فەرمووی : ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر برای مێرد یان خزمی مێرد لەگەڵ ژنەکـەیدا تەنیـا کەونو پێکەوە دانیشن چۆنە ؟ ئـەویش فەرمووی : ئەوە مردنە •

ئەگەر ئافرەت هەموو گیانی عەورەت نەبوایە بۆ پیاوی نامەحرەم • پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) نەهی نەئەکرد لەتێکەڵاو بوونو دانیشتنی پیـاوان لەگەڵیاندا ، چونکـە نەهی‌یەکە هـەموو جۆریکی تێکەڵابوون ئەگرێتەوە ، مادەم رووومەتی ئافرەتەکە دانەپۆشراو بێت ، وەك هەموو ئافرەتێ کە لەسنووری ماڵی خۆیدا رووومەتی وابەدەرەوە ، وەئەم نەهی‌یە نەنانەت شووبرایش ئەگرێتەوەو بۆ ئەویش دروست نیە لەگەڵ براژنیدا بەتەنهایی لەجێگایەکدا بمێننەوە •

٥ ـ ئـەو حەدیثەی ( عبدالرزاق )و هـەندێ کەسی تر لە ( ام سلمه )ەوە ( رەزای خوای لێبێت ) ریوایەتیان کردووە کە فەرموویەتی : کاتێ ئایەتی ( حیجاب ) هاتە خوارەوە ئافرەتە ئەنصاری‌یەکان هاتنە دەرێ ئەتوت قەلەڕەش وا بەسەریانەوە ، چونکە رووومەتیان داپۆشیبو بەچمکی جلەکانیان •

٦ ـ ئەو حەدیثەی ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردووە لە ئەنەسی کوری مالیکەوە کە فەرموویەتێ کاتێ پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) زەینەبی گواستەوە ( أم سليم ) جۆرە حەڵوایەکی دروست‌کردو ناردی بۆ پێغەمبەر ، ئـەویش ناردی بەدوای یارەکانیدا ، بەکۆمەڵ دەستیان کـرد

بەحەڵوا خواردنو گفتوگۆ ، وەخێزانەکەیشی دانیشتبوو پشتی لەوانو رووی کردبووە دیوارەکە تا ئەوان رۆیشتن ٠

ئەم فەرموودەیە بەجوانی مەبەستی ئێمە دەرئەبڕێو ناتوانین بڵێین ئەم حوکمە تایبەتی‌یە بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) چونکە لەبارەی حیجابەوە هیچ جیاوازی لەنێوان ئەوانو ئافرەتانی تردا نیە ، تەنها ئەوە نەبێ حیجاب بۆ یەکەم جار لەسەر ئەوان واجب کرا ، ئەمجا بوو بەحوکمێکی گشتی بۆ هەموو ئافرەتانی موسوڵمان ٠

٧ ـ ئەوەی ( ابن هشام ) لە ( ابن اسحاق )ەوە ریوایەتی کردوە ئەڵی : هۆی دەرکردنی جولەکەی ( بنوقینقاع ) لەمەدینە ئەوەبوو ئافرەتێکی موسوڵمان کۆڵێ شتو مەکی هێنا بیفروشێ لەبازاڕی بەنوقەینەقاع ، پاش فرۆشتنی لای زەڕەنگەرێك دانیشت ، جولەکەکان دەوریان لێداو داوایان لێکرد رومەتی دەرخا ، ئەویش بەگوێی نەکردن ، کابرای زەڕەنگەری جولەکە بەدزیەوە لەدواوە کراسەکەی بەست بەپشتیەوە ، کاتێ هەڵسا هەندێ لاشەی دەرکەوتو جولەکەکان دەسیان کرد بەپێکەنین ، ئەویش هاواری لێ هەڵساو پیاوێ لەموسوڵمانان پەلاماری دایەو جولەکەکەی کوشت ٠٠ هتد[١] ٠

---

(١) کورتەی ئەم بەسەرهاتە بەم شێوەیە : لەپاشا جولەکەی ئەو دەوروبەرە پەلاماری موسوڵمانەکەیان داو شەهیدیان کرد ، ئەمجا خزمو کەسو کاری موسوڵمانەکە هاواریان برد بۆموسوڵمانەکانو ئەوانیش رقیان هەستاو شەڕ کەوتە نێوان موسوڵمانانو بەنوقەینەقاعەوە ، وەئەمانە یەکەم تاقمی جولەکە بوون کە پەیمانی نێوان ئەوانو پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) شکاند ٠ بڕوانە : فقه السيرة ، دکتۆر محمد سعيد رمضان البوطی ، ل : ١٧٨ ٠

ئەگەر حیجابی شەرعی روومەتی نەگرتایەتەوە ئەم ژنە لەبازاڕدا بۆ پەچەی ئەپۆشی ؟ وەئەگەر ئەمەی لەبەر دینداری نەکردایە جولەکە هەوڵیان نەئەدا بەم کارە هەستی ئاینی بریندار کەن •

★ ★ ★

تاقمی دووهەم : مانای ( ما ظهر منها )ی بەرووومەت و دەست لێکداوەتەوە ، لەبەر تەوەی داپۆشینی تەو دوو شوێنە بۆ ئافرەت نارەحەتە ، وەبۆی هەیە دەریان بخات لەنوێژدا ، کە وابوو ئەبێ تەماشا کردنیشیان لەلایەن پیاوانەوە بەبێ نیازی خراپ ، حەڵاڵ بێت •

بەڵام خاوەنانی ئەم ڕایە کە بریتین لە ( مالیکی )یەکان و ( حەنەفی )یەکان و هەندێ لە ( شافیعی )یەکان[1] بۆ دروست بوونی دەرخستنی رووومەت بەشەرتیان گرتووە ئەبێ نەبێتە هۆی بەرپابوونی خراپەو فیتنە ، بەو مانایەی کە نابێ رووومەتی ساوولووس دابێ بەداوودەرمان و خۆی جوان کردبێ ، یان ئەو ئافرەتە خۆی جوان بێ لەبناغەدا ، یان لەبەردەم ئەو پیاو خراپ و فاسقانەدا بێت ، کە چاو

---

بەم شێوەیە جولەکەی ئەو کاتە عەورەتی یەك ئافرەتیان دەرخست بەڵام غیرەتی موسوڵمانان قوبوڵی نەکردو ئەو شەڕە گەورەیان لەسەری هەڵگیرساند ، بەڵام خۆ دەزگاکانی جل و بەرگ و مۆدێلی ئەورووپای ئەمڕۆ کە هەمووی جولەکە سەرپەشتی ئەکات بەملیۆنەها عەورەتی ئافرەتی موسوڵمانی خستە ئەو دەشتەو کەسێکیش نیە غیرەت بیگرێ ! ساخوا هاوارمان بگاتە لای تۆ ! •

(١) بڕوانە : احكام القرآن : ١٣٥٧/٣ ( ابى بكر بن العربى ) ، واحكام القرآن : ٢٨٩/٣ ( الجصاص ) ، والدر المختار : ٢٤٤/٥ ، پەراوێزی ( ابن عابدين ) •

لەئافرەت داناخەن‌و دوای هەواو ئارەزوویان ئەکەون ، ئەگەر ئەم شەرتانە نەهاتەجێ ئافرەت ئەبێ رومەتیشی داپۆشێ بۆ ئەوەی نەبێتە یارمەتی دەری پیاوخراپان لەگوناهەو تاوانیاندا ، وەئەوەیش بەو شێوە نەبێ کە ئەو ئافرەتە نەیەلێ ئەو فاسقانە تەماشای بکەن ، یان نەچێتە دەرەوەو خۆی نەدا لەقەرەیان ، یان پەچە بپۆشێ‌و بەرچاوی ناپاکیان بگرێ • وەئەمەی سێهەمیش ئاسانترین رێگایە بۆ ئافرەت •

بینا لەسەر ئەم رایە ئەو حەدیثە صەحیحانەی دەربارەی پەچەپۆشین باسمان کردن لەبەڵگەی تاقمی یەکەمدا ، بەم شێوە مانا ئەکرێن ، مانای ئەم پەچەپۆشینە یان لەکاتی ترسی فیتنەدا بووە ، یان لەبەر وەرع‌و تەقوای ئەو ئافرەتانە بووە ، بێگومان ئافرەتانی ئەصحاب‌و چینی دوای ئەوان ئەوەندە لەخواترس بوون‌و خۆیان پاراستووە کە رووومەتیشیان دەرنەخستووە •

## یەکگرتنی رای زانایانو ئەنجامی جیاوازییەکەیان

لەمووتو وێژەوە زانیمان کـە زانایانی ئیسـلام لـەم خاڵانـەی خوارەوەدا رایان یەکی گرتووە :

یەکـەم : درووست نیە ئافرەت لەرووومەتیو دەستی زیاتر هیـچ ئەندامێکی دەربخات ، مەگـەر لەبەردەم ئەوانەدا نـەبێ ئایاتەکە جیای کردوونەوە •

دووهەم : درووست نیە بۆ ئافرەت رووومەتو دەستیشی دەربخات ئەگەر ئـەیزانی لـەدەورو بەریدا چاوی ناپاك هەیەو بەنیازی خراپ تەماشای ئەکا ، وەئەمیش توانای نیـە رێگەی لێ بگرێ بەپەچە پۆشین نەبێ • وەئەوەی خەتیبی شەربێنی لەئیمامی حەرمەینەوە نەقڵی کردووەو ئەڵێ : زانایانی ئیسلام بەگشتی قەدەغەیان کردوە ئافرەت بێ پەچە بگەرێ ، مەبەستیان پێ ئەم حاڵەتەیە[1] •

قورتوبی دانی بەم خاڵەدا ناوەو لـە ( ابن خویزمنداد )ەوە نەقڵی کردوە کە یەکێکە لەزانا گەورەکانی مەزهەبی مالیکی ، کە ئافرەت ئەگەر جوانبوو مەترسی هەبوو لەبەرپا بوونی فیتنە ، واجبە لەسەری رووومەتو دەستیشی داپۆشێ[2] •

---

(١) مغنى المحتاج : ٣/١٢٩ •

(٢) تفسير القرطبي : ١٢/٢٢٨ •

خاوەنی پەڕاوی ( الدر المختار ) لەزانایانی حەنەفی ئەفەرموێ : نابێ لەنێو پیاواندا ئافرەتی جوان ڕوومەتی دەربخات نەك لەبەر ئەوەی ڕوومەت عەورەتە ، بەڵکو لەترسی بەرپابوونی فیتنە[٣] .

ئابەم شێوەیە هەموو زانایان ، ئەوانەیان کە ئەڵێن : ڕوومەتی ئافرەت عەورەتە وەك زانایانی مەزهەبی ئیمام ئەحمەدی حەنبەلیو ، ئەوانەیشیان ئەڵێن : عەورەت نیە ، وەك زانایانی مەزهەبی مالیکیو حەنەفی ، هەموو ڕایان لەسەر ئەوەیە کە واجبە ئافرەت ڕوومەتی داپۆشێ ئەگەر لەوەترسا بەچاوی ئارەزوو تەماشا بکرێو ببێتە هۆی بەرپابوونی فیتنەو خۆشکردنی ئاگری ئارەزوو . وەئایا کەس هەیە بتوانێ بڵێ : ئەمڕۆ فیتنە بەرپا نابێو کەس نیە بەنیازی خراپ تەماشای ئافرەت بکات ؟! .

سێهەم : هەموو زانایان ڕایان لەسەر ئەوەیە دروستە ئافرەت ڕوومەتی دەربخات بۆ کاتی پێویست ، وەك شایەتی دانو چوونە لای پزیشك بۆ نەخۆشیو فێربوونی زانیاریو .. هتد .

ڕای هەموو زانایان لەسەر ئەم سێ خاڵەی سەرەوە یەکی گرتووە ، پاش ئەمانە جیاوازی‌یان لەوەدا هەیە : ئەگەر ئافرەت لەکۆمەڵێکدا بوو کەسی تیا نەبوو بەچاوی خراپ تەماشای کات ـ وەئەمە شتێکی خەیاڵی‌یە ئەمڕو ـ لەم کاتەدا هەندێ لەزانایان ڕایان وایە بۆی دروستە ڕوومەتی دەرخا ، وەهەندێ تر ڕایان وایە کە لەم کاتەشدا ئەبێ ڕوومەتی داپۆشێ نەکا بەم کارە دەرگای فیتنە بکاتەوە .

* * *

ئەمەیە حوکمی ئیسلام دەربارەی پۆشاکی ئافرەت . فەرموودەی

(٣) ( الدر المختار ) لەسەر پەڕاوێزی ابن عابدین ) : ١/٢٨٤ .

هەموو زانایانی ئیسلامی لەسەرەو ، سەرچاوەی فەرمووده‌یان ئایەتەکانی قورئان‌و حەدیثەکانی پێغەمبەرە ( صلى الله عليه وسلم ) •

کاتێ ئەمەت زانی پێویستە بیشزانی کە ئیسلام جۆرێکی تایبەتی لەپۆشاکی ئافرەتدا دیاری نەکردووە بەڵکو ئەوەندەی بەپێویست دەزانێ ئەو بەرگە سەرتاپای دابپۆشێ‌و بگاتە سەر قولەپێی ، ئەگەر لەمە کەمتر بوو ئەوە ناشەرعی‌یە با گورەوی‌یەکی ئەستوریشی لەپێدابێت گۆشتی دەرنەکەوێ •

# فێربوونی زانستی‌و ئیشکردنی ئافرەت

ئیشکردنی ئافرەت بۆ بەدەس هێنانی ڕۆزی خۆی یا خێزانەکەی ، یان هەوڵدانی بۆ فێربوونی ئـەو زانستیانەی بە کەڵکن ؟ لێرەدا ئیسلام هیچ حوکمێکی تایبەتی بـەرانبەر بەئافرەت دەرنەبڕیوە ، ئەو حوکمـە گشتی‌یە نەبێ پیاوو ئافرەت وەك یەك ئەگرێتەوە •

ئەگەر لەهەندێ حاڵەتدا ئیسلام ڕێگای نەدا بەئافرەت لەدەرەوەی ماڵەکەی بـەشداری ئیشـێك بكات ، یان ڕێگای فیربوونی زانستی لێ گرت ، ئەوە لەبەر ئەوەیە کە ئەوکارە ، یان ئەو خوێندنە تێکەڵاوە لەگەل هەندێ گوناهو هەڵس‌و کەوتی ناشەرعی ، وەك ئەوەی ئەو ئافرەتە خۆی لەعاستی پیاوی بێگانەدا دانەپۆشێ بەو شێوەی روونمان کردەوە ، یان وەك ئەوەی کارکردنی ئافرەت ببێ بەهۆی ڕێکرتن لەئیشکردنی پیاو ، وەئەمەش ببێتە هۆی تێکچوونی ئەو واجبانەی دراوە بەسەر شانی پیاودا ، دەربارەی کاروباری خێزان بەتایبەتی‌و ، کۆمەڵی ئیسلامی بەگشتی •

وەئەم باسە ملکەچە بۆ ئەو یاسا ئوصولی‌یە بەناوبانگە کە ئەڵێ : ( ما لا يتم الواجب الا به فهو واجب ، وما يترتب عليه محرم فهو محرم ) واتە : هەرشتێ واجب بەبێ ئەو تەواو نەبێ ئەو شتەیش واجبە وەهەر شتێ ببێ بەهۆی تووش‌بوون بەحەرام ئەو شتەیش حەرامە •

ئیشکردنی ئافرەت هەرچەندە پیرۆز بێت ، بەڵام ئەگەر ببێتە هۆی ئەوەی ئافرەت لەسنووری شەرع دەربچێ‌و خۆی لەبەردەم پیاوی بێگانەدا بەرووتی بنوێنێ ، ئەوە ئەبێتە شتێکی ناڕەواو نادروست • بەڵکو ئەم کارە نەك هەر بۆژن ، بۆ پیاویش حەرامە ، چونکە هەروەك ئافرەت تاوانبارەبێ بەهۆی خۆ دەرخستنی‌یەوە لەبەردەم پیاوانی بێگانەدا ، هەروەها پیاویش نوشی تاوانی تێکەڵاوی بە ئافرەت‌و هەمیشە تەماشاکردنی حەرامیان ئەبێت‌و گیرۆدەی جوانی‌و نازو نوکیان ئەبێت •

بەشداری ئافرەت شانبەشانی پیاو لەئیشی کارگەو مامۆستایی فێرگەو جۆرەها ئیشی تردا لەدەرەوەی سنووری ماڵ ، هەرچەند لەبناغەدا شتێکی حەلاڵ بێت ، ئەگەر بوو بەهۆی تێکچوونی یاسای کۆمەلایەتی بەو شێوەی ئیسلام لەنێوان پیاوو ئافرەتدا دابەشی کردوە ، ئەوە ئەوکاتە حەرام ئەبێو نابێ ئافرەت بەشداری تێدا بکات •

خوای گەورە پەیوەندی خێزانی نێوان پیاوو ئافرەتی لەرێگای یاساو بنەڕەتەکانی ژنو مێردایەتی ( الزواج ) شەرعییەوە دامەزراندووە •

وەئەم یاساو رێبازانە کاتێ پێکیان دێت کە بارو دۆخێك بکونجێ ، تەنها لایەنێك داواکراوو خوازبێنی کراو ، وەلایەنەکەی تر داواکەرو هەوڵدەر بێت بۆ گەیشتن بەو مەبەستو داوایە •

تابەم شێوەیە ئەتوانین ئەم یاسایە بچەسپێنینو بیکەین بەتاقە پردێك ، کە لێپەڕینەوەی پێویستە ، بەبێ لادان لەو سنوورو چوارچێوەی بۆی دانراوە ، بەشێوەیەك داواکار نەگاتە ئامانجی هاوڕێیەتی لەگەڵ رەگەزەکەی تردا ( الجنس الآخر ) لەم تاکە رێگاوە نەبێ •

جا ئایا ئەبێ کامیان داواکراو بن ئافرەت ، یان پیاو ؟

لەراستیدا ئەو بارودۆخە لەباردەی بتوانێ ئەو یاسا دیاری کراوەمان بۆ بەدی بێنێ تەنها ئەبێ بەو شێوەیە بێ کە هەمیشە ئافرەت داواکراو بێتو پیاویش داواکار بێت بۆ گەیشتن بەئافرەت •

چونکە ئەگەر ئافرەت ناچار بکەین ئەو رابکا بەدوای پیاوداو هەوڵی بۆبدا ، جوانترین رەوشتی لەدەس ئەچێ ، کە پەیوەندی بەرەگەزی ئافرەتەوە هەیە ؛ چونکە خوای گەورە ئافرەتی لەلایەنی لاشەو دەروونەوە بەشێوەیەك دروستکردوە ، کە جێگای خۆشیو بەختەوەریو خۆشەویستی پیاوبێ ، زیاتر لەوەی ئەو وابێ بەرانبەر بەپیاو • بەڵکو ئافرەت کاتێ خۆی زۆر بەبەختەوەر ئەزانێ کە هەست بکا پیاو خۆشی

ئەویێو ، جێگای سەرنجی‌یەتی ، جا بۆیە ئەبێ زۆربەی کات مێرد زمانی شیرین‌بێو خۆشەویستی دەربڕێ بەرانبەر بەئافرەت ، وەئافرەتیش بەرانبەر بەمە ناز بنوێنیو پێخۆشحالی دەربڕێ بۆ مێردەکەی ..

ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە ئەو یاسای باسمان کرد بۆ پێوەندی نێوان ئەم دوو لایەنە هیچ هێزو دەسەلاتێکی نامێنێ بەلکو هەر لەناو ئەچێ ، ئەگەر ئافرەت هەوڵ بداو رابکا بەدوای پیاوداو خۆی بۆ بنوێنێ لەهەموو سەرەرێگایەکدا . چونکە هەرکاتێ پیاو ئەمەی لەئافرەت دیو ئافرەت ئاوا بەسووکی خۆی خستە باوەشی پیاوەوە ، ئیتر چ پێویستی‌یەك ئەمێنی پیاو خۆی بخاتە ژێر باری ئەو مەرجو شەرتانەوە کە شەرع بۆی داناوە ، وە کەی قانوونی نواندنو داواکردن ( العرض والطلب ) لەگەڵ ئەم کارە هەڵاوگەڕاوەدا ئەگونجێ ؟.

لەزۆر ناوچەکانی ئەورووپادا بارو دۆخێك بەسەر ئافرەتی داماودا سەپێنراوە ، ناچار بێ ئەو بەدوای پیاودا بگەڕێو داواکاربێ بۆ پیاو ، بەڵام ئایا ئەم کارە چ بارو دۆخێکی سازکرد ؟! .

خوشکی بەرێز : ئەگەر بزانی لەو شوێنانەدا چەند جار ئافرەت پێی هەڵئەکەوێو پەو پێی رائەبوێرێو گاڵتەی پێ‌ئەکا بەو هیوایەی پیاوێکی مەردو دڵسۆزی تووش بێت ؛ ئەوکاتە زۆر بەئاسانی ئەم وەڵامە ئەزانی ! .

هەر هۆی ئەمەیش بوو کاتێ پیاوان بۆیان دەرکەوت کە بەسایەی سەری هەندێ ئافرەتەوە ، رابواردنی لاکوتو چەمەنلەغیان بۆ ئاسان بووە ؛ بەم وەزعە زۆر دڵیان خۆش‌بوو زیاتر وازیان لەژیانی ژنومێردایەتی هێناو پاشەکشەیان لێ‌کرد ، بۆ ئەوەی ئافرەت زیاتر لەلاکوڵانا هەرزان بێو وێڵی دوای پیاوان بێ .

ئابەم جۆرە هەوڵدانی ئافرەت بۆ بەدەس‌هێنانی مێرد ، گەورەترین هۆ بوو بۆ لەدەسچوونی ئەو مەبەستەی لەپێناویا تێکۆشا •

شەپۆلی بێ‌ئابڕوویی لەبەر چەند هۆیەك بڵاو بوویەوە ، بەڵام ئەمەی باسمان کرد گرنگترین هۆی بوو • ژیانی خێزانی لەبەر چەند هۆیەك لێك بچڕاو شەق‌وپەق بوو ، ترسناکترین هۆیان ئەمە بوو بۆم باس کردی • ئافرەت بەختەوەری ژیانی نەماو ، جوانترین‌و بەنرخترین ئاواتی ، کە ژیانە لەپەنای مێردێکی بەوەفاداو ، لەناو خێزانێکی بەختەوەردا ؟ لەدەسچوو وەیەکەم هۆی ئەمەش لادانی ئافرەت بوو لەرێگای شەرم‌و ئابڕوو •

کەوابوو پەیوەندی جینسی نێوان پیاوو ئافرەت لەژێر سایەی ژن‌ومێردایەتی‌یەکی پاك‌و خاوێندا پێك‌نایەت بەو شێوە نەبێ کە پیاو ناچار بکرێت هەمیشە داواکار بێت‌و ئافرەتیش هەمیشە داواکراو بێت •

جالێرەدا ئەڵێین : ئایا ئەوبارو دۆخانەی کە بتوانن هەڵبسن بە جێ‌بەجێ کردنی ئەم کارە چین ؟ •

بێگومان هیچ شتێك نی‌یە بتوانێ ئەم کارەمان بۆ مسۆگەر بکات جگە لە تەتبیق کردنی سیاسەتی شەریعەتی ئیسلام لەیاسای بەخێوکردن ( الانفاق ) دا !

پیاو لێ‌پرسراوە لە نەفەقەی ئافرەت ، ئیتر ئایا ئەو ئافرەتە کچی بێت ، یان خێزانی بێت ، یان خزمێکی تری کە نەفەقەی لەسەری واجبە • وەژن ماردیی تەواوی خۆی وەرئەگرێ وەك بەخششێك بەو شێوەی خوا فەرمانی پێداوە ، ومێرد ناتوانێ هیچ هاوبەشی‌یەك لەنەفەقەی ژیاندا بخاتە ئەستۆی ئافرەتەوە ، چ جای ئەوەی ئافرەت ناچاربکا کە مارەیی بدا بەپیاو ، هەر لەبەر ئەمەیشە بەشی پیاو لەمیراتدا دوو ئەوەندەی بەشی ئافرەتە ؟ چونکە نیوەی بەشی پیاو یان زیاتر لەنیوەی لەم کەین‌و بەینەدا

ئەگەرێتەوە بۆ ئافرەت •

لای هەموو زانایانی ئابووری‌ناس ( علماء الاقتصاد ) ئاشکرایە ، هەرکەس داوای شتێك لە کەسێکی‌تر بکات ، مانای وایە دان‌ئەنێ بەوەدا پێویستی بەو شتە هەیە بۆیە بۆی ئەچێتە پێشەوەو داوای ئەکات ، وەئەم دان‌پیانانە بەڵگەیەکە بۆ لایەنی دووهەم ( داوالێ‌کراو ) کە داوای نرخ‌و بایی‌یەکەی بکات ، مانای وایە ئەبێ داواکار نرخەکە بدا •

کەوابوو هەرکات پیاوو ئافرەت زانیان کە خەرجی ژن هێنان ، لەمارەیی‌و بەخێوکردن لەئەستۆی پیاودایە ، ئیتر ئافرەت رێگای نامێنی بچێتە پێشەوەو داوای پیاوبکا ، چونکە داواکردنی ئافرەت لەکاتێکی وەهادا ، مانای دەربرینی پێویستی‌یەتی بەپیاوو مارەیی پیاو پێکەوە ، ئەمەیش پێچەوانەی یاسای گۆرینەوەی شتە بەکەڵکەکان‌و یاسای نواندن‌و داواکردن ( العرض والطلب )ە ئابەم شێوەیە هەوڵدان بۆ پێکهێنانی ژیانی خێزانی ئەبێ تەنها لەلایەن پیاوەوە بێت ، وەبەم شێوەیش پیاو بەئاسانی ملکەچی فەرمانەکانی شەرع ئەبێت بۆ گەیشتن بەمەست •

بەڵام هەرکات کۆمەڵ بریاریاندا خەرجی ژن‌هێنان‌و شوکردن لەسەر هەردو لابێت ، یان بەتەنها لەسەر ژن بێت ، وەك باوە لەهەندێ لایەنەکانی ئەوروپادا ، ئەوکاتە ئەم کارە پێچەوانە ئەبێتەوە : پیاو بەگران ئەچێ بەدەم ژن‌هێنانەوەو پەلەی تیا ناکات‌و ، خۆی مەڵاس ئەدات تامالی زیاتری دەسکەوێ ، هەروەها بەربەرەکانی زیاد ئەکات لەلایەنی ئافرەتەوە ، چونکە ئەوکاتە گەورەترین ئاواتیان‌و باشترین دەوڵەمەندی‌و مامەڵە بەلایانەوە ئەوە ئەبێ کە زەبەر بەمێردێ بەرن لەسایەیدا بحەوێنەوە ، وەبێگومان ئەگەر ئەمە بەدیهات ئیتر ئەنجامە ناهەموارەکانی تر یەك لەدوای یەك لەدایك ئەبن[1] •

---

(١) مەبەستمان ئەوە نیە رێگا بگرین لە هەموو جۆرە یارمەتی دانێك

خوشکی بەرێز رەنگــە بڵێی زۆر لەناوەڕۆکی باســەکەمان دوور کەوتینەوە ، ئەویش ئەوەبوو ووتمان : بەشداری ئافرەت لەگەڵ پیاودا بۆ کارکردن هەرچەند لەبنەواندا حەلاڵو رەوایە ، بەڵام ئەگەر بوو بەهۆی ناڕێکیو لارەسەنگی لەتەرازووی بەرپرسیاری کۆمەڵایەتیدا کە لەنێوان ژنو مێرددا دابەش کراوە ؟ ئەوکاتە حەرام ئەبێو ئەبێتە کارێکی ناڕەوا ، ئیتر ئــەم ووتوویژە دوورو درێژە پــەیوەندی چیبوو بــەئیشــکردنی ئافرەتەوە وەئایا هاوبەشی ئافرەت لــەئیشو کاردا بۆ تــەرازووی یاسای کۆمەڵایەتی لارەسەنگ ئەکا ؟ •

لــەوەڵامدا ئــەڵێین ئەنجــامی ئــەم گفتوگۆ دوورو درێژە بۆی سەلماندین کــە ئــەبێ ئافرەت هــەر داواکراوو خوازبێنیکــراو بێت • وەئەمەیش پێك نایەت بەو شێوەنەبێ پیاو هەمیشە خەمخوارو ماڵبەخش بێت ، جا کەوابوو ئێمە لێرەدا پرسیار ئەکەینو ئەڵێین : ئایا کام رێگا باشە بیگرینە بــەر بۆ ئــەوەی تەنهــا پیاو کۆڵی خێزانداریو ماڵداری هەڵگرێو ئافرەت بەشداری تیا نەکات وەلەجێگەی پیاودا دانەنیشێ ؟

وەڵام : باشترین چارە بۆ ئەوەی کاروبار بەشێوەیەکی رێکوپێك بەردەوام بێت ئەوەیە : ئافرەت بەشداری لەکاروباری دەرەوەدا نــەکات بەشێوەی ناچاریو زەرورەت نەبێ •

چونکە کاتێ ئافرەت لەکۆکردنەوەی ماڵدا بەشداری پیاو ئەکات ، مانای وایە رێگا بەپیاو تەنگەبەر ئەکاتو مەیدانی کارکردن کەم ئەبێتەوەو پێویستی ناماڵداریو خێزانداریشی وەك جاران ئەمێنێ ، وەئەمەیش ئەبێتە

---

لــە نێوان ژنو مێرددا ، بەپێچەوانەوە یارمــەتیو دەســگرۆیی مەردایەتییەو ئیســلام حــەزی پێ ئەکات ، ئەگــەر لەسنووری رەزامەندیدا بێت ، نەك بەزۆری قانون ئافرەتی پێ ناچار بکرێ •

هۆی دروست بوونی گرێ‌کرێره‌یه‌ك له‌وانه‌یه‌ هه‌ندێ که‌سی ساکار بلێ چاره‌سه‌ره‌که‌ی ئه‌وه‌یه‌ که‌ ئافره‌ت به‌شداری پیاو بکا له‌نه‌فه‌قه‌ی خێزاندا وه‌ك چۆن به‌شداری کرد له‌ئیش‌و فرماندا •

که‌وابوو به‌شداری کردنی له‌ئیش‌و فرماندا ئه‌بێته‌ گه‌وره‌ترین هۆی تێکچونی ژیانی خێزانیی‌و لادانی کارو باری خێزان له‌راڕه‌وی سروشتی خۆی ، هه‌تا ورده‌ورده‌ وای لێ‌دێ ئافره‌ت به‌دوای پیاودا بگه‌ڕێ‌و هه‌ولی بۆ بدا ، وه‌له‌م کاته‌یشدا ئافره‌ت به‌ته‌واوی کێش‌و بایه‌خی نامێنێ‌و حه‌سانه‌وه‌ی لای پیاوی به‌وه‌فای له‌ده‌س ئه‌چێ‌و له‌جیاتی ئه‌و ده‌نگی رۆژو دورۆژو دۆستی سات‌و دوسات ئه‌گرێ •

له‌کۆتاییدا ئه‌لێم : هاوبه‌شی ئافره‌ت له‌کارو کاسبیدا له‌بناغه‌دا حه‌لاڵه‌و ره‌وایه‌ ، به‌لام ئه‌م حه‌لاڵه‌ حه‌رام ئه‌بێت ، ئه‌گه‌ر بوو به‌هۆی به‌دیهاتنی شتێکی حه‌رام ، وه‌ئه‌مه‌ش له‌دوو حاڵه‌تدا ئه‌بێت :

یه‌که‌م : کاتێ ئافره‌ت به‌هۆی ئیشه‌که‌یه‌وه‌ تێکه‌ڵاوی نامه‌حره‌م ببێ‌و توانای حیجاب پۆشینی نه‌مینێ به‌وشێوه‌ی خوا فه‌رمانی پێ‌داوه‌ •

دووهه‌م : کاتێك ئیشکردنی ئافره‌ت ببێ به‌هۆی په‌یدابوونی شلۆقی‌و لارده‌سه‌نگی له‌ته‌رازووی یاسای ژن‌ومێردایه‌تی‌و کاروباری کۆمه‌لایه‌تیدا • وه‌ئه‌مه‌یش ببێ به‌هۆی به‌دیهاتنی ئه‌و کاره‌ساته‌ ناهه‌موارانه‌ی باسمان کردن • ئاله‌م کاته‌دا حه‌لاڵ ئه‌بێ به‌حه‌رام‌و گومانی تێدا نامێنێ ، چونکه‌ هه‌موو شت ئه‌بێ ته‌ماشای به‌رهه‌م‌و پاشه‌رۆژی بکرێت ، نه‌ك ته‌نها ته‌ماشای شێوه‌و رواڵه‌تی بێ جوله‌و بێ گیانی بکرێ •

١

## چەند بڕوو بەهانەیەکی هەڵبەسراو بەدەم زانستەوە

ئەمەی باسمان کرد دەربارەی جلوبەرگی ئافرەتو ، خوێندنیو ، بەشداری کردنی لەئیشی دەرەوەدا ، لەگەڵ بەڵگەی روونو بێ پێچوپەنادا کە هیچ بواری ملە جوڕێی تیا نیە ؛ بەسە بۆ کەسێك لەگەل خوادا راست بکاو بەدڵ داوای زانینی حوکمی خوا بکا ، وەبۆ کەسێك راست بکا لەگەڵ خۆیو خەڵکیدا لەباوەڕیدا بەوەی قورئان فەرموودەی خوایەو ، پێغەمبەر هەواڵە کراوی خوایە بۆ هەموو عالەمو ، مژدەدەرە بەبەهەشتو ، ترسێنەرە لە دۆزەخ •

خۆ ئەگەر کەسێك باوەڕی چەسپاوی بەخوا نەبێ ، یان بەراستی هەوڵی زانینی حوکمی خوا نەدات ، یان رەزای خوای مەبەست نەبێت ، ئەوە ئەتوانێ لەهەموو دێڕێ لەم دێڕانەی نووسیمان ، چەندەها ئیشکالو بڕو بەهانە بدۆزێتەوە کە پێچەوانەی ئەم مەبەستانە دەربخات باخۆیشی باش بزانێ کە درۆ ئەکاتو زانینی حوکمی خوای مەبەست نیە •

فەنتازی تەئویلو گاڵتە کردن بە ووشە گەلێ ئاسانەو ، بەنوئیسرائیل لەمەوبەر باشفێری بووبوون بۆ گەیشتن بەمووشەو هەڵپەی کەمی دنیا ، وەزۆر لەپارێزەرەکانی ئەمرۆیش باشی ئەزانن بۆ هەمان مەبەست ، هەروەها زۆر لەوانەیش خۆیان بەشەرعو یاسای ئیسلامەوە خەریك کردووەو ترسی خوا لەناخی دڵیانا جێگیر نەبووە ئەم دەرسەیان وەرگرتووەو فێری بوون ، بۆ ڕازی کردنی گەورەو ئاغاکانیان ، بەتەماعی

ئەوەی بەڵکـو لەمژینە کورتـەدا ملّو موشێك ، یان پایەو مەنصەبێکی بەرزیان بدەنێ •

ئیمامی شاطیبی لەکتێبی ( الموافقات )دا ئەڵێ : ( هەموو تاقمێ لەتاقمە سەرلێشێواوەکانو لەو کەسانەی جیاوازی لەنێو راکانیاندا هەیە هەموو بـەدڵی خۆیان بەڵگە شەرعیەکان تەئویل ئەکەن بەشێوەیەك راکـەی ئـەوان پەسەند بکات ، تەنانـەت هـەندێ لەفاسقەکانیش ئیشـی ناڕەوا ئەکەنو ، بەدەم شەرعەوە بەڵگە هەڵئەبەستنو ، پاڵی ئەدەن بەئیسلامی پاكو خاوێنەوە • وەلەلاپەڕەکانی مێژوودا چەندەها شت لەم بارەوە بەرچاو ئەکەوێ کە هەموویان پاڵدراون بەئیسلامەوەو کەچی لەئیسلام دووریشن • بۆ نموونە بڕوانە باسی تـەداوی کردن بـەعەرەقو شـتی سەرخۆشکەر ( المسکرات ) لـەکتێبی ( درة الغواص )ی حـەریریدا ، وەچـەندەها شتیتر ، تەنانەت هەندێ لەگاورەکان هەندێ لەئایەتەکانی قورئان ئەکەن بـەدارددەستی خۆیانو ، بـەڵگە بـۆ راستیو دروسـتی ئاینی گۆڕاوو هەڵشێواوی ئیستەیان ، وەئەڵێن : وەك موسوڵمانەکان بڕوامان بەتەوحیدو تەنیایی خوا هەیە •

بۆیە واجبـە لەسـەر ئەوکەسەی ئەیەوێ مانای دەقەکانی یاسای ئیسلام بزانێ ئەبێ تەماشای رێبازی زانا بـەرزەکانی پێشینانمان بکاتو کـەڵك لەوان وەربگرێت ؟ چونکە ئـەوان باشتر لەئێمە مانایان زانیوەو لەکردەوەو رەفتاریشیاندا لەئێمە دامەزراوتر بوون •

بـەڵام ئەمە مانای وانیە ئەوکەسەی بەدوای راستیدا بگەڕێ وێڵو سەرگەردان ئەبێت لەنێوان پڕوپاگەندەو فێڵی دەملووسەکانو ، ئامۆژگاری دڵسۆزانەی زانا دڵسۆزەکاندا ، چونکە هەرکەس بەراستی بەدوای حەقدا بگەڕێ ، ئەوە لەژێر رۆشنایی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەردا بەئاسانی

حەق ئەدۆزێتەوە ، ئەگەر ئەمەیشی نەتوانی لەرەوشتو کردەوەی پیاوباشانی رابوردودا حەق ئەناسیێو بۆی دەرئەکەوێ • وەئەگەر ئەمەیشی بۆنەکراو هیچ ئاگاداری پیاو باشانی پێشوومان نەبوو ژیانی نەئەزانین ، ئەوە ئەتوانێ لەرەوشتو کردەوەی یەکێ لەحەق پەروەرەکانی ئەمرۆداو ، لەشۆرەتی پاکیو خاوێنی لەنێو خەڵکیداو لەخۆ گرتنیدا لەبەردەم تاقیکردنەکانی ژیانداو ئارەزووەکانی هەواو هەوەسدا ؟ راستی بەدی بکاو بیدۆزێتەوە ، ئەگەر بەمانە هیچیان بەمەبەست نەگەیشت ئەوە مانای وایە خەتاو کەمتەرخەمی لەخۆیدایە ، نەك لەو کەسانەدا کە خەڵکی وێڵ ئەکەنو سەریان لێ ئەشێوێنن ، چونکە موسڵمانی راست ئەبێ هیچ نەبێ تاراددەیەك ئاگاداری دینەکەی بێتو راستو ناڕاست لەیەك جیابکاتەوە ، بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لەناڕاست دوور بخاتەوە ، ئەگەر وانەبێ مانای موسوڵمانی راست نیەو ، بەراستی ملکەچی فەرمانەکانی خوا نەبوەو ، واجبی سەرشانی بەجێ نەهێناوە •

جا ئەگەر ئەمە واجبی هەموو موسوڵمانێك بێت بەم ژیانەدا تێپەڕ بکات ؟ دیارە واجبی سەرشانی زانایانی ئیسلامیش ئەوەیە بەگوێرەی توانایان سپاردەی خۆیان بگەیەننو ، موسوڵمانان ئاگادار بکەنو ، دەستیان بگرن بۆ دۆزینەوەی راستیو ، دووریان بخەنەوەو لایان بدەن لەگزیو فروفێڵی ئەو کەسانەی بەناوی زانستەوە موسوڵمانان وێڵ ئەکەنو ، فێڵو تەڵەکەیان لێ‌ئەکەنو ، رێگای راستیان لێ وون ئەکەن •

بەڵی ! پێویستی هەموو موسوڵمانانە یارمەتی یەکتری بدەنو دەستی یەکتر بگرن بۆ زانینی راستی ، تاپێیان هەڵ نەخلیسکێو نەکەونە بەردەم قارو غەزەبی پەروەردگار ، تابەم شێوەیە موسوڵمانان خۆیان لابدەن لەداوی شەیتانەکان • وەتەڵەکەبازو درۆزنو بەناوزاناکانیش وەك گایمارۆ جیا

ئەبنەوەو ئەناسرێن ، ئەو کاتە کەس پێیان هەڵناخەڵەتێ •

ترسناکترین باس کە هەق‌و ناهەقی تێدا تێکلاو بکرێ‌و ، نیشانەکانی هەق لەبەرچاوی موسوڵمانان ون بکرێ‌و گومڕاکەران‌و تەڵەکەبازانیش گێرەشێوێنی تیابکەن بۆ وێڵ کردنی موسوڵمانان ؛ باسی ئافرەتە •

* * *

## ئەو بڕو بەهانانە چین ؟

خوشکی موسوڵمان ! یەك بەیەك ئەم بڕوبەهانانەت بۆ باس ئەکەم ، چونکە زانینیان بەڕێك‌و پێکی باوەڕت دامەزراو ئەکات بـەو راستیەی بۆمان بەیان کردیت ، وەلەفێڵی فێڵبازو تەڵەکەبازەکان دورت ئەخاتەوە ، وەچاوی زانیاری‌و تێگەیشتنت تیژتر ئەکات‌و باشتر ئەتوانی هەق لەناهەق جیا بکەیتەوە • باناهەقیش بەڕواڵەت واخۆی بخاتە پێش‌چاو کە گوایە ئەم پێشکەوتوخوازەو لافی شارستانی‌یەت لێ‌بدا ! •

* * *

بەهانەی یەکەم : فەرموودەیەکی پێغەمبەرەو هەندێ کەس کردوویانە بەبەڵگە ، کە گوایە ئافرەت بۆی هەیە تێکەڵاوی لەگەڵ پیاوی بێگانەدا بکا پڕ بەئارەزووی خۆی ، وەبێ هیچ پەردەو حیجابێك • ئەو حەدیثەیش ئەوەیە ئیمامی موسلیم لەئەنەسەوە ریوایەتی کردووە کە دراوسێ‌یەکی فارسی خۆشخوانی پێغەمبەر ( صلی اللّه علیه وسلم ) پێغەمبەری دەعوەت کرد ، ئەویش فەرمووی : ئەی ئەمە ؟ مانای ئەی عائشە ؟ کابرا ووتی : نـەخێر ، پێغەمبەر ( صلی اللّه علیه وسلم ) فەرمووی دەمنیش نایـەم ، لەپاشا دراوسێکەی هاتـەوە بانگی‌کردەوە ، پێغەمبەر ( صلی اللّه علیه وسلم ) هەمان پرسیاری کردەوە ، تا دراوسێکەی لەجاری سێهەمدا وتی : بەڵێ بائەویش بێت ئەمجا هەردوکیان هەستان‌و شان‌بەشانی یەك رۆیشتن تا چوونە ماڵی کابرا • وەئەمەیش دەقی حەدیثەکەیە : ( عن أنس رضی اللّه عنه أنّ جاراً لرسول اللّه ( صلی اللّه علیه وسلم ) فارسیاً ، کان طیب

المرق ( كناية عن طيب الطعام ) فصنع لرسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) ثم جاء يدعوه ، فقال : وهذه ؟ لعائشة ، فقال : لا فقال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) : لا ، ثم عاد يدعوه فقال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) : وهذه ؟ قال : نعم في الثالثة ، فقاما يتدافعان[1] حتى أتيا منزله • رواه مسلم •

ئەم فەرموودەیە تەنها مانای ئەوە ئەدا کە پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) حەزرەتی عائشەی ( رەزای خوای لێ بێ ) لەتەك خۆیا برد بۆ ماڵی کابرای فارسی ، ئەمەیش وەك زۆر حەدیثی‌تر وەهایە کە زۆر لەئەصحابان ( رەزای خوایان لێ بێت ) ژنەکانیان لەگەڵ خۆیان ئەبرد بۆ مزگەوت ، یان زۆر لەئەصحابەکان ئەچوون بۆ ماڵی خێزانەکانی پێغەمبەر بەگشتیو ، حەزرەتی عائشە بەتایبەتی بۆ پرسیاری شەرعی •

جا خوشکی بەرێز ! تۆ چ ناکۆکیەك ئەبینی لەنێوان ئەم حەدیثانەو ئەو حوکمە خواییەیەدا کە ئەفەرموێ : ئافرەت لەبەردەم پیاوی بێگانەدا پێویستە پەردە بپۆشێ ، وەئەگەر پیاوان داوای پێویستی‌یەکیان لێ کردن با لەپشتی پەردەوە داوایان لێ بکەنو قسەیان لەگەڵا بکەن ، بەو مانا پەردەیە هەبێ لەنێوانیانا کاتی گفتوگۆ کردنیان ؟ •

ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی تریشەوە نەچوونی پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) بۆ سەر دەعوەتی ئەو موسوڵمانە بەتەنیا خۆی شتێکی سابتەو هیچ گومانی تێدا نیە ، وەئەمە نابێ بەلەکەیەك بۆ ئەو ، بەڵکو ئەمە زیندوترین بەڵگەیە بۆ دەرخستنی بەرزی ڕەوشتی پێغەمبەر لەگەڵ خێزانەکەیدا •

---

(١) يتدافعان : مانای : پاڵەپەستۆیان ئەکرد ، بەڵام لێرەدا مانای شانبەشانی لێ بگیرێ گونجاوترە • ( وەرگێڕ ) •

جاری واهەبوو چەندەها رۆژ لەسەریەك ، ئاگر بۆ چێشت‌لێنان له ماڵی پێغەمبەردا نەئەکرایەوە وەخواردنیان تەنها ئاوو خورما بوو ، وەك عائیشە ریوایەتی کردوە •

جا ڕەوایە ئەو عائیشەی بەزیانی کولەمەرگی رازی ئەبوو لەگەڵ پێغەمبەردا ؟ پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) جێی‌بێڵێ‌و بڕوا لەسەر سفرەو خوانێکی بەلەزەت چوارمەشقی لێی دانیشێ ، دیارە دڵی پڕبەزەیی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) ئەوە قوبوڵ ناکات ، وەك قوبوڵی نەکرد بڕوا بەدەم دەعوتەکەی جابیرەوە ، لەکاتێکا گیسکێکی بچکۆلەی سەربڕیبوو ، گۆشتەکەی پڕی کاسەیەك نەئەبوو لەکاتی جەنگی خەندەق‌دا ، کە خۆی‌و یارەکانی نەبرسانا ریخۆڵەیان پێچی خواردبوو ، بەلاّم پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) هەموو یارەکانی لەگەڵ خۆیا بردو ، وەبەدەستی پیرۆزی خۆی گۆشتەکەی بۆ وردکردن‌و خۆی بوو بەئاشپەزیان‌و خزمەتی ئەکردن ، وەرازی نەبوو خۆی هیچ بخوا تادڵنیا بوو لەتێرخواردنی ئەوان ، هەرچەند لەتاو برسێتی بەردێکی لەسەرسکی بەستبوو •

بەلاّم ئەگەر لەفەرموودەی پێشوو وەها تێ‌بگەین ، کە عائیشە ( خوای‌لێ‌رازی‌بیت ) لەگەڵ پێغەمبەردا بەنیوەرووتی رۆیشت‌و ، بەو شێوە لەبەردەم موسوڵمانە فارسی‌یەکەدا دانیشت‌و ، ئەم دوخێزانە بەشێوەی خێزانە بەناوموسوڵمانەکانی ئەمڕۆ‌تێکەلاّوبوون‌و ، زەردو سوور چوو بەیەکا ، ئەمە زۆر دوورە لەمانای حەدیثەکەوەو ، بەهیچ کلۆجێ ئەم حدیثە ئەم مانایەی لێ وەرناگیرێ •

باشترین شت کە چۆنێتی ئەم رۆشتنە دوو قۆڵەمان بۆ روون بکاتەوە ، ئەم ئایەتەی قورئانە : ( ولا تبرجن تبرج الجاهلية الاولى )

وەئەم ئایەتەیش : ( واذا سألتموهنَّ متاعاً فاسئلوهنَّ من وراء حجاب )
هـەروەها ئـەم ئایەتەیش : ( ولا یبـدین زینتهن الا لبعولتهن ...
الآیة )[1] .

هەروەها ئەوحەدیثەی پێغەمبەریش کە موسلیم ریوایەتی کردوە :
کـە ( أم سلیم ) جۆرێ حەڵوای دروست کردبوو ، وەناردی بۆ ماڵی
پێغەمبەر کاتێ زەینەبی کچی جەحشی گواستەوە ، پێغەمبەریش یارەکانی
بانگ کردو پێکـەوە دانیشتن و دەستیان کـرد بەخواردن و دەمەتەقێ ،
وەخێزانەکەی پشتی کردبووە یارەکانی‌تر ڕووی لـەدیوارەکە بوو هـەتا
ئەوان ڕۆیشتن .

بـەڕاستی گاڵتە کردنە بـەئاین چاو لەم هەموو ئایەت و حەدیثـە
بنوقێنین کە چۆنێتی ڕۆیشتنی پێغەمبەرو ( صلی الله علیه وسلم ) حەزرەتی
عائیشەمان بۆ روون ئەکاتەوە بۆ ماڵی خانەخوێکەیان ، وەبەخەیاڵ و
داڵغـەی خۆمان واماناي بکەین : کـە گوایە حـەزرەتی عائیشـە وەك
کچۆڵەکانی شارستانی‌یەتی ڕۆژئاوای ئەمڕۆ ، خۆی ساوولووس دابوو
سەرو قۆڵ و بازووی لێ ڕووت کردبوو ، مەمکۆڵانی خڕ کردبوو ،
وەخۆی بۆن‌خۆش کردبوو ! وەبەمەیشەوە نەوەستین بەڵکو بچین ئـەم
خەیاڵ و داڵغەیە بکەین بەبەڵگەیەکی قایم و قوڵ و حوکمی شەرعی لەسەر
بنیات بنێین .

بەهانەی دووهەم : حەدیثێکە ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردوە لە
( سهل )ەوە ، ئەفەرموێ : ( لمّا عرس ابو أسید الساعدی ، دعـا النبی
( صلی الله علیه وسلم ) واصحابه فما صنع لهم طعاماً ولا قرّبه الیهم الاّ

---

(١) تەفسیرەکانیان رابورد .

امرأته ام اسيد ، بلّت تمرات في تور ( اناء ) من حجارة ، من الليل ، فلمّا فرغ النبي ( صلى الله عليه وسلم ) من الطعام أماثته له اي ( هرسته بيدها ) فسقته ، تتحفه بذلك ) •

کاتێ ( ابو أسید )ی ساعیدی ژنی‌هێنا ، پێغەمبەرو یارەکانی بانگ‌کرد بۆ سەر شایی‌یەکەی ، وەتەنها خێزانەکەی نانی بۆ دروست کردنو بۆی بردن ، نەختێ خورمای شەو کردبووە ئاو لە جامولکەیەکی بەردینەدا ، بەدەستی خۆی تاواندیەوە لەئاوەکەداو کردی بەشەربەتو بردیە خزمەتی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بۆ ئەوەی زیادە رێزێکی لێ بگرێ •

ئەوانەی وا حەزئەکەن ئافرەت پێشوازی میوانو هاورێیانی مێردی بکا ، یان پێشوازی خزمانی بێگانەی خۆی بکاو تێکەلاویان پێ بکا ، بۆ گفتوگۆو نان دانانو دانیشتنی سەر سفرەو خوانو خزمەت کردن ، وەك ئەمرۆ باوە لەناو ئێمەی بەناو موسولماندا ؟ ئەوانە ئەم حەدیثەیان کردووە بەداردەستیان بۆ گەیشتن بەئارەزووی خۆیان •

لای هەموان روونە کە هیچ خراپەیەك لەوەدا نیە ئافرەتێك فنجانێ قاوە ، یان پیالەیەك چا ، بباتە بەردەم میوانێك یان رێبوارێك ، بەلکو تەوانو بەدرەوشتی وا لەدیمەنی رازاوەو رووتو بۆن خۆش‌کراوی ئەو ئافرەتەی ئەمانە ئەباتە بەردەم میوان • وەئەو باوەی لەناو کۆمەلی ئەمرۆدا باوە تەنها بردنی پیالەیەك چا نیە بۆ سەر مێزی میوان بەلکو ئەو شێوە سەرنج‌راکێش‌و هەست‌بزوێنەیە ، کە ئافرەت خۆی تیا ئەنوێنێ لەگەل بردنی چایی‌یەکەیدا •

زانایانی ئیسلام گشت زانیویانە کە هیچ روونادا لەوەدا ئافرەتێکی حیجاب پۆش بەشێوەی ئیسلامی ، بچێتە ناو ژووری میوانەوەو ، نانێ یان

ئاویّ بخـاتە بـەردەم میوانەکەی‌و ، ریّزیان لیّ بگریّ‌و خیّرهاتنیان لیّ بکات ، وەمیّردەکەی یان باوك‌و براکەی دانیشتبن •

هەر بەم‌جۆرەیش بوو ریّز لیّ‌گرتنی خیّزانەکەی ( ابو أسید ) لەمیوانەکانی لەکاتی شایی‌یەکەی ( ابو أسید )دا ، وەك ( ابن حجـر ) لەمانای ئەم حەدیثەدا ئەلّیّ : بیّگومان ئەمە لەکاتیّکدایە لەروودانی شتی خراپە نەترسین‌و ، ئافرەتەکەیش بەتەواوی خۆی داپۆشیبیّ[1] •

وەبەزۆری مەزانە شایی‌یەك پیّغەمبەری خوای تیابیّ ( صلی الله علیه وسلم ) ، بووك هەستیّ‌و پیّشوازی لەپیّغەمبەربکاو ، ریّزی لیّ‌بگریّ‌و ، خواردنی بۆ بەریّ ، وەئەمە هیچ خراپەیەکی تیا نیە بۆ پیّغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم ) •

ناڕەوایی‌و خـراپە لـەوەدا بوو ئەگـەر ئـەو ئافرەتـە خـۆی برازاندایەتەوەو ئەندامەکانی خۆی دەربخستایەو لەبەردەم ئەو پیاوانەدا بەرووتی دابنیشتایە ، وەنایشگونجیّ ئـەمە رووی دابیّ‌و هیچ بەلّگەیەك لەسەرشتی وەها لەم حەدیثەدا دەست ناکەویّ •

زۆرلە ئافرەتە موسولّمانەکان لەکاتی غەزادا تەداوی بریندارەکانیان ئەکردو ئاویان ئەدا بەتینوەکان ، وەیەکیّ لەوانە ( أم سلیم ) بوو ( رەزای خوای لیّ بیت ) • ئایـە کیّ ئەلّیّ ئەمە مانای وایە ئافرەت بۆی هـەیە بـەئارەزووی خـۆی تیّکـەلاّوی پیـاوان ببیّـتو خـۆی بۆیان بنویّنیّ‌و برازیّنیّتەوە ؟ بەلّکو هـەندیّ لەزانایان فەرموویانە ئافرەت پایـەی قازیّتی ( القضاء ) ئەدریّتیّ لـەو کاروبارانەدا کـە شایەتی ئافرەتی تیا دروستە ، وەهەروەها بۆی هـەیە پایەی فتوادان بگریّتە دەست • ئایە کیّ هـەیە

---

(١) فتح الباری : ٩/٢٠٠ •

بتوانێ لەسەر بەڵگەیەکی زانستی بڵێ : کە وابوو ئافرەت بۆی هەیە لەسنووری شەرمو ئابڕو دەرچێو ، بەئارەزووی خۆی لەبەردەم هەموو کەسدا خۆی دەربخات •

بوکێك بەدەستی خۆی شەربەتی بردە خزمەتی پێغەمبەری خوا ( صلى الله عليه وسلم ) ، کە وابوو ئافرەت بۆی هەیە بەرازاوەیی خۆی بخاتە بەردەم پیاوان !•• ئەمە وەك ئەوە وایە یەکێ بڵێ : خوا بازرگانیو کڕینو فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە ، کە وابوو بازرگان بۆی هەیە سووبخواو گزی بکا !•• هەرکەس شارەزای ئاینی ئیسلام بێت ، زۆر باش ئەزانێ ئیسلام چاودێری بەرژەوەندی هەموو کەسێكو هەموو جۆرە بەرژەوەندی‌یەکانی کردووە پاش ئەوەی تەتەڵەی کردوەو پاكوخاوێنی کردوە لەهەموو هەڵسو کەوتێکی ناپاكو ناڕێك •

ئایا خاوەنی ئەم شوبهەو بەهانەیە مانای ئایەتی ( ولا يبدين زينتهن ) وائەکات کە گوایە خوای تعالی ئافرەتی بەشتێکی قیزەون داناوەوە بۆی نیە بچێتە دەرەوەو بەشداری چارەسەرکردنی هیچ دژوارێك بکات ، یان لەهیچ کاروبارێکا هاری‌کاری پیاو بکات ؟•• ئایا نازانێ گەورەترین دەسەڵاتی ئیسلام لەوەدا دەرئەکەوێ ، کە توانیویەتی لەهەموو کاروبارێکی کۆمەڵ بکۆڵێتەوەو چارەسەر بۆ گەورەو بچوك دانێ ، بەشێوەیەك بەختەوەری دنیاو پاشەڕۆژ دابین بکات ؟•

بەهانەی سێهەم : زۆر لەئافرەتە ناودارەکان لەهەموو چەرخێکی ئیسلامیدا تێکەڵاویان زۆر بوەو پەچەیشیان نەپۆشیوە •

خاوەنانی ئەم ڕایە لەناو پەڕاوەمێژوویی‌یەکاندا ناوی چەند ئافرەتێکی موسوڵمانیان دیوە کەگوایا هیچ گوێیان بەوە نەداوە بەرووتی

لەبەردەم پیاواندا بگەڕێن و لەناویاندا دانیشن بێ‌هیچ سڵەمینەوەیەك لەپیاو •
ئـەم ئافرەتانە عائیشەی کچی طلحـة باس ئەکـەن ، کەقـەت روومەتی نەپۆشیوە ، وەهەروەها ( سکینە )ی کچی حسەین ، کە جێگای تایبەتی هەبوە لەدانیشتنە ئەدەبیەکاندا لەناو شاعیرو ئەدیبەکاندا ، وەهیندی کچی نوعمانی کوڕی بەشیر ، کـە لـەزۆر موناسەبەکاندا لەبـەردەم پیاواندا بەروومەت رووتی دەرئـەکەوت ، وەخێزانـەکەی (عبدالملك)ی کوڕی مەروان ، وەخاتوخەرقای عامیری و فاطیمەی کچی ، کە جیگای تایبەتی خۆیان هەبوو لەدانیشتنەکانی کاتی حەجدا ، هەتا ( ذو الرمة ) دڵی چوو لەفاطیمەو قەسیدەیەکی پیا هەڵبەست ، وەهەروەها ( ولادة ) کە دڵداری ( ابن زیدون ) بوو ، وەئیبنـو زەیدون لەگـەڵیا دائـەنیشت لـەکۆڕە ئەدەبیەکەیدا •

هەڵگرانی ئەم شوبهەو بەهانەیە هەواڵی ئەم چەند ئافرەتە ئەکەن بەبەڵگەو ئـەڵین : کەوابوو ئیسلام ئافرەتی بـەندی حیجاب و پـەردە نەکردووە ، وەئافرەت بۆی هەیە بەئارەزووی خۆی تێکلاو بێ لەگەڵ پیاوداو بەشداری دانیشتن و کۆبوونەوەکانی بکا •

ئایا ژیان و بەسەرهاتی ئەم ئافرەتانەی مێژوو کام لەسەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلامی و کام بەڵگەی شەرعین ؟•• فەرموودەی خوایە ؟ یان سونەتی پێغەمبەرە یان یەکدەنگی زانایان ( الاجتماع )ە ، یان قیاس و حەمل کردنی شتێکە بۆ سەر شتێکی تر ؟ خۆ دوای ئەم چوار شتەیش هیچ سەرچاوەمان نیە یاسای لێ هەڵگۆزین !••

ئـەم ئافرەتانە هەرچەند خاوەن شان‌وشەوکەت بن بەلای هەندێ کەسەوە ، بەڵام ئەمانە ئادەمیزادن وەئادەمیزادیش بەگشتی شایانی هەڵەو گوناهن ، وەك پێغەمبـەرمان ئەفەرموێ : ( کـل بنی آدام خطّاء وخیر

الخطّائين التوّابون ) هەموو ئادەمیزاد تاوانبارن ، وەباشترینی تاوانباران ئەوانەن زۆر پەنا ئەبەنە بەو تەوبەو پەشیمانبوونەوە لەگوناهەکانیان •

ئـەمە لەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە ئەم ئافرەتانە ئەوەندە کەمن بەپـەنجەی دەست ئـەژمێررێن ، وەلەگەڵ ئـەماندا لەهەموو زەمانێکدا زۆربـەی ئافرەتانی موسـوڵمان ملـکەچ بوون بۆ حیجـابی شـەرعیو دوورەپەرێز بوون لەبێگانەو نامەحرەم • ئایا بۆچی حاڵی ئەو زۆربەیە نەکەینە بەڵگەی شەرعیو چاویان لێ بکەین ، وەبچین بڵێین بەو چەند کەسەدا خاوەنی ئەم شوبهەو بەهانە ناوی بردونو بیانکەین بەسەرمەشقو چاویان لێ بکەین •

بـەڵێ عائیشەی کچی طەلحە ڕوومەتی دانەئـەپوشی وە ( مصعب کوڕی زبیر )ی مێردی زۆر جار لەسەر ئەمە سەرزەنشتی ئەکرد ، وەئێمە لەم هەڵوێستەی مەصعەبدا بەڵگەیەکی بەهێز بەدیئەکەین بۆ قسەکانی خۆمان ، لەهەمان کاتیشدا باشترین بەرپەرچە بۆ وڕاوەی خاوەنانی ئەم بەهانەیە کە هەڵسوکەوتی ئەم ئافرەتە ئەکەنە بەڵگەی رای پڕوپوچیان •

هەروەها فاطیمەی عامیری وەك ـ ئەڵێن ـ لەبەردەم پیاواندا ڕوومەتی دەرئـەخست ، هـەتا ( ذو الرمة ) گیرۆدەی بوو ، وەزۆر لەقـەسیدە عەزەلیەکانی بەشـانو باڵای ئـەودا هەڵداوە ، هەروەها ( ولادة )یش پێشوازی ئەدیبو شاعرەکانی ئەکـرد لەدیوەخانە ئەدەبیەکەی خویداو خۆی بۆ ئەرازاندنەوە هەتا ئیبنو زەیدوون شەیدای بوو • بەڵام قەسەم بەخـوا ئـەوینی ئیبنو زەیدوونو ( ذو الرمة ) بۆ ئـەم دوو ئافرەتەو شەیدابوونیان پێیانەوە باشترین بـەڵگەیە بۆ دەربڕینی راستیو رەوانی فەرمانەکانی خواو ، بـەهێزترین بەرپەرچە بۆ ئارەزووی ئـەو ئارەزوو پەرستانەی ئەیانەوێ بەسەرهاتی ئەم ئافرەتانە بکەن بەدەلیلی شەرعی •

پوختەی ئەم ووتو ویژە ئەوەیە کە بەلگەی شەرعی ، یان قورئانە ، یان سوننەتی پێغەمبەرە ، یان ئیجماعی زانایانە ، یان قیاسی روداوێکە کە حوکمەکەی بەم سێ سەرچاوە بەیان نەکرابێ ، بۆ سەر روداوێکی تر کە حوکمەکەی بەیەکێ لەم سێ سەرچاوە ئاشکرا کرابێ • تەنها ئەم چوار بەلگەیە بۆیان هەیە دەس بکێشنە ناو هەلس‌وکەوتی ژیانی مرۆڤەوە ، وەهەلس‌و کەوتی هیچ مرۆڤێك بۆی نیە دەست درێژی بکات بۆ لابردن ، یان گۆران ، یا راڤە کردنی ئەم بەلگە شەرعی‌یانە •

ئەم قسانەش لای هەرکەسێك بەراستی بیەوێ لەراستی بگات ؛ روون‌و ئاشکران ، بەلام ئەگەر یەکێ خاوەنی مەبەستێکی دیاری کراوبێت یان دوای ئارەزووی نەفس کەوتبێ ئەوە چاو لەهەق ئەنوقێنێ‌و خۆی لەئاستیا گێل ئەکات لەپێناوی بەدەست هێنانی ئارەزووەکانی نەفسدا •

* * *

بەهانەی چوارەم : بەناو بەلگەیەکی ئیجتیهادی‌یەو ، لەروالەتدا لەسەر بناغەیێ لەبناغەکانی ئوصول دامەزراوە کە ئەلێ : ( ئەحکام ئەگۆڕێ بەگۆڕانی زەمان ) ، وەبەم شێوەیە لێکی ئەدەنەوە :

گوایا ژیانی مرۆڤ لەرابوردودا لەسەر بناغەی پیشەسازی‌و دەسەلاتی ئامێر نەوەستابوو ، لەبەر ئەوە زۆر پێویستی بەکرێکارو قۆڵ‌و بازوی کارگێڕان نەبوو ، وەئەو یاسایانەی سەبارەت بەئافرەت‌و ژەیری ئافرەتن لەگەڵ شێوازی ژیانی ئەوکاتەدا ئەلوا ، وەبۆ داخوازی‌یەکانی پلەی شارستانی‌یەتی ئەوسا لەباربوو ، وەهیچ پێویستی‌یەك نەبوو بۆ دەرچوونی ئافرەت لەماڵ مەگەر لەهەندێ کاتی پێویستدا نەبێ •

بەلام لەکاتێکدا ژیان ئاڵ‌و گۆڕێکی وەها گەورەو سەرسوڕهێنەری تێکەوت ، وەئامێر بوو بەتەوەر ( محور )ی پەرەسەندنی شارستانی‌یەت

لای هـەموو گەلێـك ، وەپیشـەسازی بوو بـەپێویستیو سـەرچاوەی پێشکەوتن ، لەم کاتەدا ئاتاجی هێزو توانای هەموو قۆڵو بازوویەك بووین ، لەبـەر ئەوەی لەجوڵەی ئامێر دوانەکەوینو پێشکەوتنێکی پیشـەسازی بەرهەم بێنین ، ئەمەیش بەوشێوە ئەبێ ئافرەت ـ کە نیوەی کۆمەڵە ـ لەبەڕێوەبردنی ئەم ژیانە تازەو ، کەڵكوەرگرتن لەشێوازی ئەم چەرخو کاتەدا هاوبەشی پیاو بکا • وەئەم هاوکاری‌یەی ئافرەتیش بۆ پیاو لەپێناوی ئاسانکردنی رێگای ناڕەحەتو پڕ لەتەنگو چەڵەمەی پێشکەوتندا دەست نادات و ناگونجێ ؛ تائافرەت بەتـەواوی لەدەستوپێوەنی حیجاب خـۆی رزگار نەکاتو ئازاد نەبێت ، چونکە ئەو زەمانەی حیجابی ئافرەتی تیـا پـەیدا بوو بەسەرچوو ، ئـەبێ ئەوحوکمە شەرعی‌یەپێش لەو زەمانەدا هـەبوە سەبارەت بـەئافرەت بگۆڕیو بەسەربچێ ، لەسەر ئـەو بناغـە ئوصوولی‌یەی ئەڵێ : ( تتبدل الاحكام بتبدل الازمان ) ، ئەم بەهانە وابەسەر زاری زۆربەی خەڵکی ئـەمڕۆوە لەکاتێکدا هەندێکیشیان ئەزانن ئـەمە فرۆفێڵێکە بۆ خەڵەتاندنی موسوڵمانان ، وەهەندێکیش هەر بەراستی بـە بەڵگەیەکی شەرعی ئەزانن‌و ، لەناو خەڵقدا فتوای پێ ئەدەن •

لـەراستیشدا نەئەم بناغە ئوصولی‌یەی ئـەوان کردویانە بـە بەڵگە پەیوەندی بەم باسەوە هەیەو ، نەئاڵو گۆڕی پیشەسازی هەڵبەسراویش پێویستی بەم فاتوفیتە هەیە کەئەوان تەپڵی بۆ لێئەدەن •

ئـەم قسەیە لەناو گەلێکا ئەکرێ کـە کارگەکانی لەبەر زۆریو فراوانی چۆڵ بوبێتو هێزی دەسوبازووی نەبێ بیبا بەڕێوە ، یان لەناو گەلێکدا بگەرێین بەوڵاتەکەیدا تەنها لاوێکی بێکارەی جادەپێوی تیا دەس نەکەوێ کـە لەسوچو قوژبنی چاخانەکاندا تەقەی دۆمینەی بێت ، یان باوێشـکی بـەتاڵی بدا • خـۆ دیارە ئـەم گەلـەیش هێشتـا لـەووڵاتە پێشکەوتوەکانیشدا لەدایك‌نەبوە •

ئـەم جۆرە کەسانە وائـەزانن بۆیـە ئافرەت لەئەمریکاو ئەوروپادا لەکارکردندا هاوکاری پیاو ئەکا بۆ یارمەتیدانی یەکتر ، تابگەن بەجوڵەی ئامێرداو لێی دوانەکەون !•

لەبەر ئـەم وڕاوەیە ئەمانیش واحـەز ئەکەن داخی دوا کەوتن‌و بێدەسەڵاتی خۆیان بەوە بڕێژن کوێرانە چاو لەوان بکەن ، بەڵام تەنها لەوشتانەدا کە رێگایان بۆ خۆش ئەکات بۆ تێرکردنی هەواو هەوەس‌و ئارەزووی چەمووشی جینسی‌یان • بۆیە لافی شارستانی‌یەت لێ ئەدەن‌و ، بانگی خەڵکی بۆ ئەکەن ، تەنهـا لـەرێگای ئارەزووبازی‌و تیکڵاو بوونی نێرو مێوە ، هەر ئەڵێی بەم دیعایە پڕوپوچانە هەرچی دەرگای داخراو هەیە لەبەردەم پێشکەوتندا هەموویان خستووەتە سەر گازی پشت •

وادیارە ئەمانە لەیادیان چووە کە قسەکانیان وڕاوەیەو ، لەسـەر بناغەی زانستی‌و تێگەیشتن نەکراوە •

چونکە هاوکاری ئافرەت‌و پیاو لەئەوروپادا دوو هـۆی سەرەکی هـەیە :

یەکەم : هەڵچونی هێزی بەرە للاێی‌و زابواردنی جینسی بەرادەیەك ئافرەت‌و پیاو بێ یەکیان ناکرێ لـەهیچ لایەنێك لەلایەنەکانی ژیاندا • پیـاو ئەیەوێ لەزانکۆو فێرگەو فەرمانگەو کارگەو ئوتیل‌و چێشتخانەو سەرجادەدا چاوی لەروومەتی پڕ لەمیکیاجی ئافرەت نەبڕێ • خۆ گومان لەوەدا نیە ئەمەیش بارێکی ناهەموارو نالەبارەو شازەو دوور لەسروشتی خاوێنی ئادەمیزادەو ، ئەبێتە هۆی نەگبەتی‌و بەدبەختی هەردو لایان •

دووهەم : چاوچنۆکی‌و رەزیلی‌و هەڵپەکردن بۆ کـۆ کردنەوەی ماڵ‌و سامان • پیـاوی رۆژئاوایی ئەمڕۆ گیرۆدەی ئەم چاوچنۆکیە بێ سنوورەیە ، بۆیە هیچ بەلایەوە پێویست نیـە دایکی یان کچەکەی یان

ژنەکەی بەخێوبکاو سەرپەرەشتی‌یان بکات ، وەئەمەش ئافرەت ناچار ئەکات خۆی بژێنێ ، ئیتر ئایا بەفەرمانبەری بێت ، یان بەکرێکاری یان بەشاگردی لەچێشت‌خانەو ئوتێلەکاندا یان لەهەر جێگایەکی ترو بەهەر جۆرێکی تر •

ئابەم شێوەیە زیادەڕەوی‌و لەسنوور دەرچوون هەموو کات ئەبێ بەسەرچاوەی چاوچنۆکی‌و باوەش کردن بەدنیاداو یارمەتی نەدانی بێ‌دەست‌و نەداراکان •

ئەوانەی هەوڵی بەرەڵلایی‌و تیکلاوی نێرو مێ ئەدەن‌و برو بەهانەی بۆ ئەدۆزنەوە پێویستەبزانن وەك هەموو رۆشنبیرێکی تر ــ کە تاواندنەوەی رۆژئاوا لەبۆتەی مادده پەرەستیدا بوو بەهۆی رووت بوونەوەیان لەرەوشتی بەرزو هەستی مرۆڤایەتی ، بەراددەیەك بوون بەچەند کۆپەڵەیەکی بێ سەرو گوێی ماددی وەك تەشی لەنێو ماددەدا سوڕ ئەخۆن ، بناغەو بنەڕەتی خێزان لەناو ئەواندا نەماوەو ، شیرازەی بەتەواوی بچڕاوەو هەریەکەیان بوون بەئامێرێکی ماددی‌و ژمارەیەکی دیاری کراو ماڵ‌و سامان بەدەس ئەهێنن !••

ئابەم شێوەیە خێزان لەئەوروپادا ناوێکەو ناوەڕۆکی نیە ، وەئەم کارەساتە بووە بەدرمێك‌و زۆربەی ناوچەکانی ئەوروپای داگرتووە زۆر نزیکە تووشی بەلایەکی کوشندەو وێرانکەریان بکات •

سبحان الله ! هەر بەم شێوەیە مێژو هاتوەو چووە ! لەناوچوونی ولاتی رۆمان هەر بەهۆی هەڵچوونی ئارەزووی جنسی‌و بەرەڵلایی‌یەوە بوو ، تابوو بەهۆی بەرپابوونی هەمان نەخوشی لەناویاندا ، چاوچنوکی‌و رژدی لەلایەکەوەو ، رابواردنی زۆرو بەرەڵلایی لەلایەکی ترەوە ، هەتا فەیلەسوفی دانایان کانون هاواری لێ‌کردن‌و وتی :

ئەی رۆمان پێتانی رائەگەیەنم ئەم گەلەی ئێمە بەگشتی ، تووشی دوو بـەڵای کوشندەو دژ بەیـەك هاتوون : چاوچنۆکی‌و مشت‌قوچاندن لەلایەکەوەو ، زیادەڕەوی لەرابواردن‌و بەرەڵلایی لەلایەکی دیکەوە ، وەهەر ئەم دوو بەڵایە بوو وولاتە گەورەکانی جیهانی وێران‌و تەفرو توونا کرد[1] ٠

ئابـەم شێوە وەبەبیانووی هاوکاری پیاوو ئافرەتەوە بۆ فریاکەوتنی جووڵەی ئامێرو ، دەست‌گرتن بەسەر ژیانی پڕ لەمەینەتی پیشەسازیدا ، ئەیانەوێ ئافرەت بهاونە ناو زەلکاوی بێ‌ئابڕوویی‌و بەرەڵلایی‌یەوە ٠

بەڵام کاتێ کە ئێمە زانیمان کە نیازی گڵاویان تێر کردنی ئارەزوو رازی‌کردنی هەواو هەوەسی خۆیانە ، نابێ شێتانە چاویان‌لێ‌بکەین‌و دوای ئـەو بڕو بەهانە هەڵبەسراوانە بکەوین ، زیاد لەمەیش لووت بەحەوادا بـەرز کەینـەوەو وابزانین کاتێ چاومان لـەوان کـرد ئیتر هیچمـان نـەهێشتۆتەوەو ، لەهـەموو لایەنێکەوە خـۆمان گـەیاندووە بەکاروانی پێشکەوتنی جیهانی ٠

پیرۆزترین شت بەلای یاسای ئیسلامەوە ، پاراستن‌و رێز لێ‌گرتنی بنەماڵەو خێزانەو چاودێری کردنی یەکێتی‌و پەیوەندی‌یەتی ٠ کەوابوو چۆن ئێمە بەئیجتیهادی دەس‌کردی خۆمان کارێکی وابکەین ، ببێتە هۆی تێکدان‌و تەفروتوونا کردنی ئەم یەکێتی‌یە پیرۆزە ٠

★ ★ ★

ئەمە هەموو ئەو بەهانانەیە کە دوشمنانی حیجاب کردویانە بەبیانووی خۆیان‌و لەمە زیاتر هیچیان بەدەستەوە نیە ٠

---

(١) دائرة المعارف ، فريد وجدى : ٨/٦١٨ ٠

وەمن بۆم دەرکەوتووە هەموو ئەم برو بەهانانە چەند پەردەیەکن بۆ وونکردنو دوورخستنەوەی حوکمی روونی ئیسلامی لەبەرچاوی موسوڵمانان ، تەنانەت ئەوانەیش ئەم شوبهەو بەهانانە بلاو ئەکەنەوەو دیعایەی بۆ ئەکەن خۆیان ئەم راستییە باش ئەزانن‌و بڕوایان بەقسەکانی خۆیان نیە ، بەڵام هەمیشە زمانی خۆیان گرتووە مەبادا قسەیەك لەدەمیان دەرچێ‌و پێچەوانەی بەهانەکانیان بێت‌و راستی بۆموسوڵمانان ئاشکرا بێت • وەك ئەو تاقمەی خوا دەرهەقیان ئەفەرموێ : ( وجحدوا بهـا واستيقنتها أنفسهم ظلماً وعلواً ... )[1] •

واتە : ئینکاری ئەو بەڵگەو راستی‌یانەیان کردوو نەچوونە ژێری ، لەکاتێکا لەکانگای دڵو دەروونیانەوە بڕوایان هەبوو کەئەو بەڵگانە راست‌و رەوانن ؛ بـەڵام هەرئینکاریان ئەکـرد لەبـەرستەمکاری‌و ملهـوڕی خـۆیان •

زیاد لەمەیش ئەگـەر وافەرزکەین ئـەم برو بیانوودی ئەوان کـە بەبۆڵەی دەمیان دنیایان پێ پڕ کردووە ؛ چەند بەڵگەیەکی راست‌و رەوانن ـ هەرچەند وایش نیـە ـ ئالەم کاتەیشدا ئـەم بەڵگانە بـەهیچ جۆرێ بڕیاری ئەم بارە ناهەموارە نادەن کە زۆربەی ئافرەتی ئەم چەرخەی تیا ئـەژی •

کام لەم چوار بەهانەیەی باسکران رێگا بەئافرەت ئەدا بەسەر چەقی رێگاکاندا بەگەردن رووتی‌و قوڵو بازووی رووتـەوە بگـەڕێ ، یان کامیـان بەلایەوە رەوایە ئافرەتی موسوڵمان رێز لەمیوانەکانی بگـرێ‌و لـەجیاتی رازاندنەوەی سفرەوخوان خـۆی بۆیان برازێنێتەوەو کوڵمی سـوور بکـاو سەرنجیـان رابکێشێ‌و ئارەزوویان بزوێنێ ، وەك حاڵی

---

(1) النّمل : ١٤ •

ئەمڕۆی زۆربەی خێزانە بەناو موسوڵمانەکانی ئەمڕۆ •

ئابەم شێوەیە زانیمان ئەودەردەی ئەمڕۆ ئێمە پێوەی ئەناڵێنین دەردێکی ئایینیو کۆمەڵایەتی زۆر ترسناکەو هیچ پەیوەندی‌یەکی بەم بەهانەو شوبهە دەستکردانەوە نیە نەلەدوورو نەلەنزیکەوە •

ئەمەی باسمان کرد راستی‌یەکەو ئینکار ناکرێ مەگەر لای ئەو کەسانە کەراستی پێشێل ئەکەنو ، بەناوی دڵسوزیشەوە ترس‌و بیمی خۆیان لەحیجاب پۆشینی ئافرەت دەرئەبڕن •

ئێمە لێرەدا پرسیارێ ئەکەینو ئەڵێین : ئایا جێگای مەترسی بۆ گەلو کۆمەڵ ئەو ئافرەتەیە کە ترسی خوا لەدڵیا جێگیر بوبێو ، لەبەر رەزامەندی خوا لەبەردەم پیاوانا خۆی داپۆشێو ، پڕ شەرمو حەیا بێتو ، خۆی بۆ نامەحرەمو بێگانە نەنوێنێ مەبادا یەکێ گیرۆدەی بێتو تاوانی خۆیشیو ئەویش بچێتە ئەستۆی • یان ئەو ئافرەتەیە کە ئەڵێ : کورە جلو بەرگ‌و پەڕۆو پاڵ هیچ نیە ، مەرج پاکیو خاوێنی دڵو دەروونە ، ئەگەر دڵ پاك بێ بالاشە هەر رووت‌بێ ، ئەوەتە فلانە ئافرەت‌و فیسارە کچ کەس خراپەی لێ نەدیونو نموونەی باشەو داوێن پاکین ، کەچی حیجابیش ناپۆشنو تێکلاوی پیاوانیش ئەبن ، هەتا بەم جۆرە شەیتان لەراستی لائەداو تێکلاو بەهەموو کۆڕێکی نامەحرەم ئەبێتو ، خۆی بۆیان رازاوەو بۆن خۆش ئەکاتو ئارەزوویان ئەبزوێنێ بێ ئەوەی لا بەلای هیچ رەوشت‌و یاساو نەریتێکا بکاتەوە ، مەگەر ئەو مۆدیلانە نەبێ کە یەك لەدوای یەك هەمیشە وان لەگۆڕاندا ، لەژێر چاودێری دەزگاکانی جل‌وبەرگی ئەورووپاداو ، بەفەرمانی جولەکەو سەهیۆنیزم ؟!•

بەڵێ ئەی خوشکی عاقڵ ئەمجارەیش ئەڵێم : تو خوا بەڕای تۆ ئەم دوانە کامیان ئەبێتە هۆی نەخۆشی‌یەکی دەروونیو ، کۆمەڵایەتیو ،

رەوشتی ، کە ئاتاجی گوێ پێدانو چارەسەر کردن بێت ؟

تاکەی بەناوی پێشکەوتنەوە خەڵق بەرەو دوا بگێڕینەوەو ، بەناوی زانستی‌یەوە جەهلو نەفامی بڵاوبکەینەوەو ، بەناوی سەربەستی‌وە عەقڵو هۆشی ئەو خەڵقە دیل‌بکەینو وێڵو سەرگەردانیان بکەین ؟ •

کێ هەیە پێمی بسەلمێنێ کە حیجابی ئافرەتی موسوڵمان بچوکترین زەرەرو زیانی گەیاندبێ بەکۆمەڵو ، بەشارستانی‌یەتی کۆمەڵو ، بەزانستی کۆمەڵ ؟ بەڵکو بەپێچەوانەوە لەهەر لایەکا بوبێ هەمووی خزمەتی کۆمەڵایەتی‌و زانستی‌و رەوشت پەروەری بووە •

ئەوانەی مەترسی خۆیان لەحیجابی ئافرەت دەرئەبڕنو داوای سوفورو رووت بوونەوە ئەکەن ، ئایا تووشی چاونێشە بوونو نابینن کەرووتی‌و تیکەڵاو بوونی نێرو مێ چی پێ‌کردینو بەکوێی گەیاندین ، وەبێجگە لەخراپەو داوێن‌پیسی هیچی فێر نەکردینو هیچمان لێ نەبەستەوە ، ئەی بۆچی مەترسی خۆیان لەم بارەوە دەرنابڕنو هەوڵێ نادەن بۆ چارەسەرکردنی ئەم فەسادەو ئەم دەردە کۆمەلایەتی‌یە کە خێزانانی بەناو موسوڵمانی تیا رۆچووەو ، تا بینەقاقای نوقم بوەو لەهەموو سەرجادەو لاکۆلانێکدا بەجۆرێك گڕی گرتووەو بەرپابووە ، کە شەرمو ئابڕو وەك پووشی پایز ئەسوتێنێو لەناوی ئەبات •

## چەند قسەیەکی بێ بایەخ

ئەم شوبهەو بەهانانە هەرچۆن بن ، دوژمنانی ئیسلام چەند قسەو بەڵگەیەکی بێ بایەخی تریان هەیە ، وایان نیازە بیکەن بەپاڵپشتی بەهانە پڕو پووچەکانیان ، بەڵام لەراستیدا چەند قسەیەکی بێ ڕێو جێن هیچ خاوەن عەقڵێك پەسەندیان ناکات ، وەئەتوانم بڵێم جۆرێکە لـەو بەڵگە روکەشانـەی زانایانی مـەنتیق ناویان بردوە بـە ( سفسطة ) ، وەزیاتر مەبەستیان بەم قسانە خەڵەتاندنی نەفسە نەك رازی کردنی عەقڵ •

بەشێکی زۆر لەئافرەتانی موسوڵمان بەم قسانە هەڵخەڵەتان‌و وێڵ بوون • وەکاتێ بەخۆیان زانی کـە هەڵخەڵەتێنراون کـە پێزانینیان بێ سوود بوو ، چونکە کەوتبوونە ناو لیتەو چاڵاوێکی وەهاوە کـە نەیان ئەتوانی لێی دەربازبن •

وامنیش لیرەدا - بەگوێرەی توانا - ئـەم قسـە روکەش کراوانە ئاشکرا ئەکەم‌و ئەیانخەمە ڕوو ، بەو هیوایەی خوشکی موسوڵمان کاتێ ئەمەی زانی زیاتر خۆی لەسەر راستی بگرێ‌و بەشانازی‌یەوە باوەشی پیا بکاو هەق لەناهەق جیا بکاتەوە •

★ ★ ★

پێت ئەڵێن : داوێن پاکی‌و رەوشت بەرزی کچ شتێکی شاراوەیەو بەڕۆو باڵەیەك نیە بدرێ بەسەر لاشەیا ، چەندەها ئافرەت هەیە سەرومل پێچراوەو بەڕواڵەت پاك ، بەڵام لەژێردوە دەسی لەگەڵ خراپەدا تێکەڵاوە •

زۆر کچیش هـەیە سەروەل بەدەرەوە بوو کـەچی ناپاکیو بەدرەوشتی ڕێگای بەدەروونو ڕەوشتی نەبردوە •

منیش پێت ئەڵێم بەڵێ ئـەمە ڕاسـتە ئەگەر ئافرەت خۆی ناپاك بێ جلوبەرگو پەڕۆو پاڵە ، داوێن پاکیو ڕەوشت بەرزی بۆ ناچنێ •

زۆر ئافرەتی بەد ڕەوشت هەیە کە ڕوومەتی ناپاکی بەپەچەو عەبا دائەپۆشێ ، بۆیە کـەس ناتوانێ بڵێ : حیجابو جلوبـەرگ دەروونی ئافرەت پاك ئەکاتەوە ، یان بڵێ : هەر ئافرەتێ حیجابی نەپۆشی مانای وایە داوێن پیسەو خلیسکاوەتە ناو زەلکاوی بێ ئەخلاقی‌یەوە •

خـوای گەورە بۆیـە حیجابی لەسەر ئافرەت فـەرز کردووە بۆ پاراستنی خاوێنی پیاو ، نەکا چاویان بەلاشەی ڕووتی ئافرەت بکەوێ • کەوابوو فەرز کردنی حیجاب وەنەبێ تەنها لەبەر پاراستنی پاکو خاوێنی ئافرەتبێ ، هەرچەند ئەویش بەشداری پیاوە لەوەرگرتنی ئەم کەڵکەدا • بەڵام بێگومان خۆ دەرخستنی ئافرەت زیاتر زەرەری بۆ پیاوان هـەیە تاژنان ، ئەگەر وانەبوایە هەندێ کەس بۆی هەبوو بڵێ : ئافرەت ئەتوانێ بەڕووتی بگەڕێ بەمەرجێ بتوانێ خۆی بپارێزێو لەداوێن پاکی خـۆی ئەمین بێ •

بەڵێ گیرۆدە بوونی لاو ، لاوی داماو ، بەلاشەی ڕووتو هەرزانی ئافرەتـەوە گەورەترین بەڵایـەکە کۆمەڵی ناچـار کردووە بۆ ئـەوەی چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوە ، وەتـەنها یاسای خوایش چارەسەری ئـەم نەخۆشیو دەردە کۆمەلایەتی‌یەی گرتوەتە ئـەستۆی خۆی ، وەئـەگەر پیاوانو لاوان ئـەم نەخۆشی‌یە بـەم دەرمانە چارەسەر نەکەن بێگومان تەشەنە ئـەکاو ئافرەتیش ئەگرێتەوە ، ئەو کاتە بێسوودە ئەگەر ئافرەت بڵێ : من ڕەوشت بەرزو داوێن پاکم ، چونکە بڵێسەی گڕی ئەو ئاگرەی ،

لاشەی رووتی ئافرەت لەدەرەوونی لاودا هەڵی ئەگیرسێنێ ، تەڕو ووشك ئەسوتێنیو ، دامەزراویو رەوشت پاكی ئافرەتیش ئەكا بەقەرەبروت •

وەپێت ئەڵێن : هەركات كوڕو كچ بەتەواوی لەهەموو لایەنێكی ژیاندا تێكلاوی یەكتر بوون ، ئەو كاتە سروشتیان دامەزراو ئەبێو ( دۆستایەتی ) یەكی خاوێن ئەكەوێتە نێوانیان بێ هیچ مەبەستێكی جینسی ، یان نیازێكی خراپە ، بەڵام ئەگەر بەباشی یەكتر نەناسنو هەمیشە نێوانیان تەیمان كرابێ ، ئەو كاتە زیاتر بلێسەی ئارەزوویان گڕ ئەگرێو شێتانە پەلاماری یەكتر ئەدەن ، وەئەمەش تووشی كپ كردن ( كبت )یان ئەكاتو ، رەوشتیان خوارو خێچ ئەكات •

منیش ئەڵێم : ئەمە راستە ئەو دیمەنو رواڵەتانەی سەرنجی گەنج رائەكێشنو ئارەزووی ئەبزوێنن بەرەو خراپە ؛ هێزو توانایان كەم ئەبێتەوەو ، گەنج ساوازی لێیان ئەبێتەوە ، بەهۆی خوو پێوە گرتنو بلاو بوونەوەیان لەهەمو سەرجادەو لاكۆلانێكا ، بەڵام ئەم ساوازی بوونەوە لای ئەو كەسانە ئەبێت كە بەتەواوی تیا رۆئەچنو لەبەروبوومی بێشەرمیو بێئابڕوویی ئافرەت تێر ئەخۆنو ، ماوەیەكی دوورو درێژ نۆشی ئەكەن ، خۆ دیارە ئەمەیش لەبەر ئەوە نیە ئەو جۆرە لاوانە لەبەر رەوشت بەرزییان لەخراپە دوورە پەرێز بوون ، بەڵكو لەبەر ئەوەیە لێی بێزار بوونو ، لەبەرچاویان كەوتوەو ، رۆژانە تێری لێ ئەخۆن •

بۆ نموونە چاوپێكەوتنی دیمەنو هەڵوێستی وروژاندنی جینسی لەولاتێكی وەك ( سوید )دا ، شتێكی ئاسایییەو شوورەیی نیە بەلایانەوە ، لەبەر ئەوەی خوویان بەو جۆرە شتانەوە گرتووەو لەناویدا پەروەردە بوونو پێگەیشتوون •

بەڵام ئایا كێ ئەتوانێ بڵێ ئەمە مانای وایە گەلی سویدی دیمەنی

جینسی کاری تێ ناکاو لەپلەی ئارەزووی جینسی تێپەڕیان کردوە ؟! •
دیارە شێتیش قسەی وا ناکات !••

لای هەموو ژیرێك روونە کە لەو جۆرە شوێنانەدا ئەو کەسەی تێئەپەڕێ بەلای دیمەنێکی بێشەرمانـەی جینسی‌داو لای لێ ناکاتەوەو ئـەو دیمەنە سەرنجی راناکێشێ ، هۆی ئەوەیە کەپاش ماوەیەك هەمان کـەس لەلایەکی ترەوە تێری لێئەخوات • کەوابوو گوێ نەدان بـەو دیمەنە ئاژەڵی‌یانە هـۆی بڵاوبوونەوەیەتی بەشێوەیەکی هەرزانو تاڵان لەهەموو لایەکدا ، وەهۆی بیرو راو تێگەیشتنێکی تازەو نوێ نیە دەربارەی ئەو دیمەنانەی بەرچاو ئەکەون •

ئەو کەسەی ئەم راستی‌یە نەسەلمێنێ وەك ئەوە وایە بڵێ : ئەگونجێ برسی واز لەخواردن بێنێو تێری لێبخوات تەنها بەوەی بەسەر جادەیەکدا تێپەرێو بۆنی جۆرەها خواردنی بەتامو بەلەزەت بکات کە لەچێشتخانەکانی ئەم بەرو ئەوبەری جادەکەدا ئامادە کراون •

جا توخوا خوشکی ژیرو بەڕێز برسی بەبۆنی کەباب تێر ئەخوات بان زیاتر برسێتی یاد ئەکەوێتەوەو پەرۆشی ئەو خواردنە ئەبێتو ئەڵهای خواردنی ئەکات ؟! •

هاوڕێیەتی‌و ( دۆستایەتی ) نێوان کوڕو کچیش چەند وشەیەکە خستوویانەتە سەر زاریان تەنها بۆ ئەو کاتانەی جەنابی دۆسەکان پشووی تیا ئەدەن ، دوای تێر خواردنیان لەلەوەڕگای ئاژەڵی‌و بێ ئابڕوویدا •

وەئەمەیش راستی‌یەکی سەلمێنراوەو دۆستان خۆیان لە هەمووکەس چاکتر ئەیزانن •

خۆ کپ‌کردنەوە ( الكبت )یش‌پیلانێکی تریانەو ئەیخەنە کار بـۆ

ترساندن‌و هەڵخەڵەتاندنی لاو ، ئەگینا باپرسیار بکەین : ئایا کام شت لەم دوانە ئەبێتە هۆی کپ کردن‌و سەرکوت کردنی ئارەزووی جینسی ؟ :

ئەمەیان کەگەنج لەماڵ بچێتەدەر بۆسەر کاروباری خۆی ، وەچاوی بەهیچ جۆرە دیمەنێك نەکەوێ هەستی بزوێنێ‌و ئارەزووی بئاڵوزێنێ‌و بە لەسەرخۆیی‌و حەساوەیی‌و دەروون‌سافی بگەرێتەوە بۆ ماڵ • یان ئەوەیان کە گەنج لەماڵ دەرچێ‌و بەرەو ڕووی جۆرەها هەڵوێستی بزوێنەری جینسی بێ‌و دەروونی گڕ بگرێ‌و ئارەزووی هەڵچێ ، وەئەگەر ویستی بچێ ئارەزووی تێر بکا قانون لەلایەکەوە خزم‌و کەس‌وکارو مێردی ئافرەت لەلایەکی ترەوە پەلاماری بدەن‌و شاتاوڵی بۆ بهێنن ؟! ••

ئەمەوێ پێم بڵێی ئەم دوانە ، ئەم دوو هەڵوێستەی باسمان کرد کامیان ئەبنە هۆی کپ‌کردنی ئارەزووی جینسی ؟ • ئەم پرسیارەم کرد لەقوتابی‌یەکی زانکۆ ، کە لەبەردەم مندا واخۆی دەربڕی کەگوایە مرۆڤێکی پێشکەوتوخوازەو دژی کپ‌کردنی ئارەزووی جینسی‌یە ، بەڵام ئەوەڵامی ئەم پرسیارەدا دەمی بوو بەتەڵەی تەقیوو نەیزانی چی بڵێ ، منیش پێم ووت : وادیارە شاڵاوی شەڕی تۆ وەنەبێ تەنها بۆ سەر حیجابی ئافرەت بێ‌و بەس ، بەڵکو ئەتەوێ هەموو ئەو سنوورانەی یاسای خوایی‌و دنیایی لەنێوان نێرو مێ‌دا دایان ناوە ؛ بەجارێ بڕوخێنێ‌و لەبناغە دەری بهێنی ، بۆ ئەوەی مرۆڤایەتی بەتەواوی قۆڵی بەرەڵلایی لێ هەڵکاو ببێتە برای ئاژەڵ ، بەو هیوایەی سەرفەراز بێت لەو کپ‌کردنەوەی تۆ دوژمنایەتی ئەکەی •

جا ئەگەر وات نیازە ، جارێ تانە لەحیجابی ئافرەت مەدە تا نەچی زۆر بەلێهاتوویی‌و ئازایانە رووبەرووی مێردو باوکو ، رووبەرووی یاسای خواو یاسای سەرزەویدا ؟ باسەکەت بکەیتەوەو رازی‌یان بکەی بەو پرۆژە ئاژەڵی‌یەی وابەدەستەوە ، جا ئەگەر ئەوان بەقسەیان کردی‌و هاتن بەدەمتەوە ، ئەوە مانای وایە نارەحەت ترین پلەت بڕیوەو ئەتوانی هێرش بەریتە سەر ئەو حیجابەی هیچ پێویستی‌یەکمان پێی نامێنێ •

★ ★ ★

پێت ئەڵێن : حیجابی ئافرەت رێگای هاوبەشی کردنی پیاوی لێ‌ئەگرێ لەراپەڕینی رۆشنبیری‌و کۆمەڵایەتیدا ، وەیەکەم هەنگاو بۆ هەموو گەشەکردنێکی بیری‌و کۆمەڵایەتی ئەوەیە ئافرەت خۆی لەهەموو دەست‌و پێوەنێکی حیجاب دەرباز بکا ، وەهەر پەرژین‌و سنورێك لەنێوان ئەوو پیاودا دروست کراوە بیشکێنێ‌و پێ‌شێلی‌کات • وەگەورەترین هۆی لە ناوبردنی لێهاتوویی‌و ئامادەیی ئافرەت بۆ هەموو چالاکی‌یەکی دەروونی‌و کۆمەڵایەتی ، ئەوەیە کە ئافرەت لەقەفەزی حیجابدا دیل بکرێ‌و بەناوی شەرم‌و ئابڕووەوە خۆی لەپیاو دوورەپەرێز بگرێ •

سەیر ئەوەیە ئەمانە هەرکاتێ باسی نەزانی‌و دوا کەوتوویی ئەکەن لەدیمەن‌و رواڵەتی ئافرەتێکی حیجاب پۆشدا ئەمە ئەخەنە پێش‌چاو ، وەهەرکات باسی پێشکەوتن‌و گەشەکرنی دەروونی‌و کۆمەڵایەتی ئەکەن لەوێنەو رواڵەتی ئافرەتێکی سفورو رووت‌و قوتدا ئەمە ئەخەنە پێش چاومان •

وەمن پێت ئەڵێم : ئەم هاوشانی‌یە لەنێوان نەزانی‌و حیجابدا ، یان لەنێوان زانیاری‌و روتیدا شتێکی هەڵبەسراوو دوور لەراستی‌یە ، وەلەسەر هیچ بناغەیەکی زانیاری بنیات نەنراوە •

من ئـەزانمو بەچاویخۆم دیومە کـە لـەکیژۆڵە زانکۆیی‌یەکاندا چەندەها حیجاب‌پۆش هەیە کـە بەجوانی سەرو ملیان داپۆشیوەو ترسی خـوا لەدڵیاندا جێگیر بووە ، وەلەهـەمان کاتدا لەراپەڕینی زانسـتیو رۆشنبیریدا لەهاوڕێکانیان پێشکەوتووترن •

لەئەفریقیاو هەندێ شـوێنی ئەوروپادا زۆر دیمەنی بێ ئابڕوییو رووتی هەیە بێ ئەوەی هیچ یارمەتی‌یەکی زانستیو رۆشنبیری بدەن !•
وەلەهەمان کاتدا زۆر دیمەنی پڕ لەشەرمو ئابڕو هەن لای زۆر لەئافرەتان بێ ئەوەی ئەو شەرمو ئابڕووە هیچ لەرادەی زانستیو رۆشنبیری کـەم کردبێ •

هەرکەس شارەزای لاپەڕەکانی مێژووی ئیسلامی بێت باش ئەزانێ ئـەو مێژووە پاکـە ، پڕە لەچەندەها ئافـرەتی تێگەیشتوو خوێندەوار ، وەلەهـەمان کـاتدا لـەخوا ترس‌و بـەئابڕو ، سـەرەتا لـەسەردەمی ئەصحابەکانەوە هەتا ئەمڕۆی ئێمە •

دواکـەوتن چـەند هۆیەکی تایبـەتی خۆی هـەیە ، وەهـەروەها پێشکەوتنیش چـەند هۆیەکی خـۆی هـەیە ، وەهیـچ پەیوەندی‌یەکی بەحیجاب‌و شەرمو ئابڕوی ئافرەتەوە نیـە ، وەبەستنی ئـەم دوو شـتە بەیەکەوە فێڵ‌و تەڵەکەیەو هیچ خاوەن ویژدانێ نایسەلمێنێ •

بـەڵێ راستە زۆر کات نەفامیو نەزانیو بیرکۆڵی هاوڕێ ئـەبێ لەگـەڵ حیجاب‌و پەچەو عـەبادا ، وەك ئافرەتی ئەمڕۆی نیوە دۆرگەی عەرەبیو کەنداوی عەرەب ، بەڵام ئەبێ بزانین ئەم هاورێیەتیو بەیـەك گەیشتنە لەنێوان ئەم دوو شتەدا لەسەر شانی چەند بارو دۆخێکی تایبەتی ئەو ناوچەو لەسەر شانی پیلانەکانی ئیستیعمار وەستاوە ، وەموسوڵمانان هەرکات لێ‌نەوەن بەئاسانی ئەتوانن زاڵ‌بن بەسەر ئەم بارو دۆخەداو ئەم

دووشته لێك ببڕنو لێكیان جیا بكەنەوە ، چونكە ئیسلام وەك فەرمانی داوە بەپۆشینی حیجابو رەوشت بەرزی ، هەر بەو شێوەیش فەرمانی داوە بەزانستیو فێربوون ، وەهەریەكێ لەم دوو شتەی كردووە بەپاڵپشتو یارمەتیدەری ئەوی تریان •

وەپێت ئەڵێن : ئەو كچەی خۆی لەچاوی گەنج ئەشارێتەوەو حیجاب ئەپۆشێ ، ئەوە مانای وایە تەمەنی لاویو هەموو ژیانیشی بەفیرۆ ئەڕواو ، بێبەش ئەبێ لەژیانێكی بەختەوەرانەو شووی بۆ نابێو گەنج پێی رازی نابێ ، چونكە گەنج كاتێ دڵی لەكچ ئەچێ كە بەباشی ببینێو دڵی بگرێ ، وەچۆن دڵێ لێی ئەچێ ئەگەر ئەو كچە خۆی دەرنەخاو جوانیەكانی نەخاتە پێش چاوی گەنج ؟ •

ئابەم جۆرە پیری دایكان رۆڵەكانیان ئەترسێنن ؛ چونكە دایك وائەزانێ بەم كارە كچەی تووشی خێر دێتو رێگای دووری بۆ نزیك ئەكاتەوە بۆ دۆزینەوەی مێرد •

لەو لایشەوە سەربازەكانی شەیتان زیاتر ئەو دایكە ئەترسێنینو پێی ئەڵێن : ئەگەر كچەكەی بەجۆرەها شێوە خۆی نەڕازێنێتەوەو حیجاب لەبەری دانەماڵێو لاشەو جوانیەكانی نەخاتە رووی لاوەكان ؛ لەوانەیە پاشە رۆژی بسوتێو بێ مێرد سەربنێتەوە •

منیش ئەڵێم : ئەی خوشكم بەم جۆرە قسانە ئەیانەوێ فێڵ لەتۆبكەنو لەراستی لاتبدەن ، ئەگینا ئەم قسانە پێچەوانەی واقیعن ، وەلەئەنجامی سەر ژمێری یەكاندا دەركەوتووە كە نیسبەتی ژنو ژنخوازی لەبنەماڵە موسوڵمانەكاندا دووچەندانەی بنەماڵەو خێزانە دوور لەئیسلامیەكانە • بەمانای داواكردن بۆ ئەو ئافرەتانەی كە حیجاب ئەپۆشن نزیكی دووچەندانەی داوا كردنی ئەو ئافرەتانەیە كە گوێ بەحیجابی شەرعی

نادەن ، وەئــەگەر بەشێوەیەکی فراوانتر بۆی بچین بۆمان دەرەکــەوێ کــەرێژەی‌ژن‌هێنان‌و شوکردن‌لەنێو کوڕان‌و کچــانی موسوڵماندا زیاترە لەدووچەندانەی رێژەی ژن‌هێــنان‌و شوکردنی کــوڕان‌و کچــانی دوور لــەیاسای ئیسلام‌و ئــەوانەی وێڵی دوای شارستانی‌یەتی رۆژئاوا بوون ، وەهەرکەس تەماشای سەر زمێری‌یە گشتیەکان بکات ئەم راستی‌یەی بۆ روون ئەبێتەوە •

وەبۆ ئەوەی زیاتر ئــەم راستی‌یەت بــۆ روون بکەمەوە هــۆکانی ئەخەمە پێش‌چاوت تا زیاتر بڕوات بەحیکمەتی خوای گەورە دامەزراو بێت ، وەبۆ ئەوەی بزانیت بەرژەوەندی مرۆڤایەتی پارێزراو نابێت لەژێر سێبەری یاساکەی خوای گەورەدا نەبێت •

گەنج لەم کۆمەڵەی ئێمەدا لەدوو جۆر بەدەر نیە :

جۆری یەکــەم : بــەدینەو بەگوێرەی توانا دەست بەفــەرمانەکانی خواوەو ، بەئەحکامی ئیسلامەوە ئەگرێ • ئــەم جۆرە گەنجە لەتەمەنی بیست ساڵی‌یەوە تاسی ساڵی ژن ئەهێنێ ، مەگەر یەکێ زرۆفێکی تایبەتی هەبێ بۆی رێك نەکەوێ ، وەژن هێنان بەلای ئەم تاقمەوە وەك بەربانگی رۆژووەوان وەهایە ، هەرچی هیواو ئاواتەکانی ژیانی هەیە کۆی ئەکاتەوە بۆ ئەو کاتەو ، وەئەو رۆژو ساتە بەسەرچاوەی بەختەوەری دائەنێ •

ئەم تاقمە گەنجە بەدوای کچێکا ئەگەڕێن بەدڵی خۆیان بێ ، بەڵام بەمەرجێ لەسنووری حیجابی شــەرعی دەرنەچوبێت‌و ئابڕوی نەتکابێ‌و لەژێر سایەی ئایین‌و باوەڕدا بژی •

ئەم جۆرە گەنجە کاتێ ئەزانن ئیسلام رێگای داون ، بگرە داوای لێ کردوون ، تەماشای روومەت‌و دەستی ئەو ئافرەتە بکەن کە نیازیان

هەیە داوای بکەن[1] ، وەئەگەر لەجاری یەکەمدا باش نەیبینیو دڵنیا نەبوو بۆی هەیە جاریَ تریشو جاریَ تریش لێی ورد بێتەوەو تەماشای ئەو دوو شوێنەی بکات ، تا بەتەواوی دڵنیا ئەبێ ، کەوابوو بەهیچ شێوەیە تووشی دژواری نەناسینو نەشارەزایی نابن لەدیمەنی ئەو ئافرەتەی ئەیانەوێ بیکەن بەهاوەڵی ژیانیان ٠

جۆری دووهەم گەنجێکە لەژێر سایەی دینا نەماوەو گوێ بەحەڵاڵو حەرام نادات‌و هەرچۆن بۆی لوا رائەبوێرێ ! ٠

ئەم جورە گەنجە ئەگەر ژنیش بێنن ئەو ژنهێنانە ئەکەن بەزەخیرەی کاتێ کە ئەچنە ساڵەوەو لێ ئەکەون ، وەهیچ گەنجێ لەمانە پێش تەمەنی سی‌وپێنج ساڵی خۆی گیرۆدەی ژن‌وماڵ ناکات مەگەر لەبەر زروفێکی تایبەتی ٠

ژنهێنان بەلای ئەمانەوە وەك گەڕانەوەی کۆچەری‌یەکە بۆ ماڵەکەی پاش گەشت‌و رابواردنێك کە هەرچی وزەو توانای هەیە تیایدا لەناوی بردبێ ، هەتا تەواو هیلاك‌و ماندو بووەو گەڕاوەتەوە بۆ ماڵەوە بۆ پشودان‌و حەسانەوە !٠٠ ئەم تاقمە بێ ئەوەی باری گرانی خێزانداری‌یان نابێتە سەرشانیان تێریان لەرابواردن خواردوە ، وەئیستە بۆیە ژن ئەهێنن

---

(١) بۆیە تەماشا کردن تەنها بۆ ئەو دوو شوێنە دروستە ؛ چونکە جوانی‌و ناشیرینی لەرومەتدا دەرئەکەوێ ، وەقەڵەوی‌و لاوازی لەدەستدا دەرئەکەوێ ٠ ئیتر کەوابوو پێویست بە تەماشاکردنی هیچ شوێنێکی تر ناکات ٠
هەروەها سونەتە بۆ ئافرەتیش تەماشای خوازبێنی‌کەری خۆی بکا پێش ئەوەی بریاری شووپێکردنی بدا ؛ چونکە هەروەك پیاو حەز بەجوانی ژنی ئەکا ، هەروەها ئافرەتیش حەز بەجوانی مێردی ئەکا ٠ بروانە : مغنی المحتاج ، ٣ ، ل : ١٢٨ ٠

تا لەژێر سایەیدا بحەوێنەوەو ئۆقرە بگرنو پێلاوی ئاوارەییو دەرسەدەری لەبەرماڵەکەی ئـەودا داکەنن ؟ نەك لەبەر ئەوەی بیانەوێ لەگەڵ ئـەو ژنـەدا ژیانێکی بەختەوەری بـەسەر بەرنو شـەربەتی رابواردنی ژنو مێردایەتی لەسەرەتاوە بنۆشن •

زۆر جار دیومانە گەنجێك وادەری بڕیوە کە گوایە بەتەمای ژنهێنانەو بەدوای هاوسەرێکی ژیاندا ئەگەرێ بەدڵی خۆی هـەڵی بژێرێ ، هـەتا زۆر لەو کیژۆڵانە کە رایان وایە ئەبێ کیژ لەسەر جادەو لاکۆڵانەکاندا مێردی خـۆی بدۆزێتەوە ؛ لێی کۆبونەتەوەو هەریەك بـەجۆرێ خویان بـۆ ئارایش داوەو جوانیو نەرمیو خـاوی خۆیان ئاراسـتەی کردوە ، ئەویش بەهەلی زانیوەو هەر رۆژەی لەگەڵ یەکێکیاندا رایبواردوەو لەپاشا وازی لێ هێناوە بێ ئـەوەی هیچ زەرەرێك بکـا یان بچێتە ژێر هیـچ بارێکـەوە •

لەنێوان پیاوو ئافرەتدا جیاوازییەك هەیە لەکاتی پێشبڕکە ( مسابقة ) کردنیاندا بـۆ گەیشتن بەئارەزوەکانی نەفسو داخوازییەکانی جینس ، بەڵام کەم کەس هەست بەم جیاوازییە ئەکات ، ئەویش ئەوەیە کە هەموو کات ئافرەت لـەم پێشبڕکەیەدا ئەیدۆڕێنێ ، چونکـە ئافرەت هەرچەند لـەژێر سایەی دینو خواپەرەستیشدا نەمێنێو گوێ بەئەخلاقو رەوشت نەدات ، هەست بەبـەختەوەری ژیان ناکاتو تامو لەزەتی شیرینی ژیان ناچێژێ تا لەژێر سایەی خێزانێکا نـەحەسێتەوەو باڵی یـەکجارینەی لێ نەداوەتەوەو دایە دایە بانگی لێ نەکرێ • وە بەپێچەوانەی ئەمەوە پیاو هەرچۆن بێت حـەز بەرابواردنێك ئەکات لـە دوور بێت لەبەر پرسیایو منداڵ بەخێو کردنو چوونە ژێر باری منداڵداریو خێزانداریەوە ، وەهیچ هێزێکیش ناتوانێ پیاو لـەم حەزو هیوایەی ببڕێ تەنها دینداریو ترسی خوا نەبێ ، ترسێك کە زاڵ بێ بەسەر هەواو هەوەسیدا ، خۆ هەرکات

دین لەئارادا نەما ، ئەو کاتە پیاوو ئافرەت لەسەر سفرەو خوانێك بەیەك ئەگەن کە هەمیشە ئافرەت تیایدا دۆڕاوو بەش‌خوراو ئەبێ !٠

بوختەی ئــەم وتووێژە لەواقیعی ژیاندا بــەچاوی خۆمان دەبینین پێویستی بەبیر کردنــەوەو دووپات کردنەوە نیە ، ژمارەی ئەوانەی ژن ئەخوازن لەلاوە موسولمانەکان دوو ئــەوەندەی ژمارەی ئەولاوانەن کــە لەژێر سایەی دینداری دەرچوون ، وەبێ گومان لاوی بەدین لەبنەماڵەیەکی پاکو خاوێن‌و لەخواترسدا نەبێ هاوسەری خۆی هەڵنابژێرێ ، وەڕازی نابێ بەجوانی‌یەك کە لەگەڵ رەوشت‌و ئایندا نەبێ ، بۆیە لەئەنجامی ئەم باســەدا بۆمان روون ئەبێتــەوە کــە شوونــەکردن‌و ژن نــەهێنان زیاتر لەوخێزانانەدا بلاّوە کە گوێ بەفەرمانەکانی ئایین نادەن ٠

* * *

خوشکی باوەڕدار ! ئەمەی باسمان کرد بەســە بۆ ئەوەی دڵنیات بکات لەوەی کە بەگوێ کردنی فەرمانەکانی خواو شوێنکەوتنی ئاینەکەی وەنەبێ تەنها بەرزەوەندی پاشەڕۆژت بۆ مسۆگەر بکات‌و بەس ، بەڵکە لەگەڵ ئەمەیشدا بەدی‌هێنانی بەختیاری دنیایش ئەگرێتە ئەستۆی خۆی‌و حەسانەوەو دڵنیایی راستەقینەت پێ ئەبەخشێ ٠

کە مادەم ئەمەیشت زانی ئیتر کاتی ئەودیە ، پاش خەوێکی قورس‌و لەبیرچوونــەوەو لادانێکی دوورو درێژ ؟ ســەدەم فــەرمانەکانی خــوای پەروەردگارەوە راپەڕی‌و بەدەم بانگەوازی قورئانەکەیەوە داوالێبی ، تارێگا بگرێتە بــەر بۆ لای خواو روەو زاتی پاکی ئەو بکەوێتە رێ سابەڵکو خۆشەویستی خوا شەفاعەتت بۆ بکات لەدادگاکەی ئەودا ٠

گوێ نەدەی بەچەن‌و چوون‌و گەزو پێوانەی ئەم‌و ئــەو ، چونکە سبەی رۆژ حسابی خوا گەلێ بەسامترو ترسناکترە ٠

چـاو مەبڕە ڕەزامەندی فلان‌و فیسار ، چونکە ڕەزامەندی خـوا لەپێش ڕەزامەندی هەموو کەسەوەوەیە وەهەر ئەویش کەڵکی پاشەڕۆژت نـەگرێ •

خوشکی بەڕێزم لەکاتی گەڕانەوەتدا بۆ لای خـوا ئەبینی هەندێ کەس بەرەنگارت ئەبن‌و ئەیانەوێ مێشکت کاس بکەن ، بۆ ئەوەی ملکەچی ئەو یاساو نەریتە نەفامی‌یانە بیت ، کە چوار دەوریان داویت ، وەباسی فلانـە خانم‌و فیسارە ئافرەتت بـۆ ئەکەن کەچۆن خۆیان ئەڕازاندەوەو لەبەردەم پیاواندا خۆیان دەرئەخست تا بەدڵی خۆیان بۆ بوو ! •

بەڵام من یادت ئەخەمەوە بەحوکمی خوا کـە بەروونی بۆم باس کردی ، وەیادت ئەخەمەوە بـەم فەرموودەی پێغەمبەرە ( صلی الله علیه وسلم ) کە ئەفەرموێ : ( صنفان من أهل النار لم أرهما قط ، قوم معهم سیاط كأذناب البقر ، یضربون بها الناس ، ونساء كاسیات عاریات ،میلات مائلات ، رؤسهن كاسنمة البخت المائلة لا یدخلن الجنة ولا یجدن ریحها وأن ریحها لیوجد من مسیرة كذا وكذا ) رواه مسلم •

مانای : دوو تاقم هەن ئەهلی دۆزەخن ، من نەمدیون ، تاقمێکیان جۆرێ دارحەیزەرانیان بەدەستەوەیە ئەڵێی کلکی مانگایە ، خەڵکی بێ تاوانی پێ دەق ئەدەنەوە ، وەئافرەتانێکی رووت‌و قووت‌و جل‌و بەرگ ناتەواو ، یان تەنک بەشێوەیە گۆشتی گیانیان دەرکەوێ ، ئەڕۆن بەڕێدا خۆیان بائەدەن‌و بەنازو فیزەوە هەنگاو هەڵئەنێن قژیان خڕ کردووە وەك سەرپشتی ووشتر ، ئـەوانە ناچـنە بەهەشت‌و بۆنیشی نابیسن ، لەکاتێکا بۆنی بەهەشت ئەونە ئەونە ئەڕوا •

خوشکی موسوڵمان هەر لەم ڕێگادا چەند کەسێ ڕێگات پێ ئەگرن‌و باسی جوانی دنیات بۆ ئەکەن‌و هەڵت ئەنێن بۆ تێر خواردن لەنازو نیعمەت‌و

رابواردنەکانی ژیان ، بەڵام من ترسناکی ئەو پاشە ڕۆژەت یاد ئەخەمەوە کە چاوەڕێمانە ئاگادارت ئەکەمەوە بەساماناکی ڕۆژی قیامەت ئەگەر باوەڕت بەو ڕۆژە هێناوە ، ئەو ڕۆژەی خوا بانگ ئەکا لەکو مەڵیك و پێیان ئەفەرموێ : ( ويوم يعرض الذين كفروا على النار أذهبتم طيباتكم واستمتعتم بها فاليوم تجزون عذاب الهون بما كنتم تستكبرون في الارض بغير الحق وبما كنتم تفسقون )[1] •

مانای : لەرۆژێکد بێ باوەڕان ئاراستەی ئاگری دۆزەخ ئەکرێن و پێیان ئەوترێ : ئێوە لەژیانی دنیادا بەشە خۆشی خۆتانتان بردو پڕ بەدڵی خۆتان ڕاتان بواردو بەئارەزووی خۆتان پەلتان کوتاو ، کۆتان لەساردو گەرم نەکرد ، دەی ئەمڕۆ سزای سەختو ریسواکەر بچەژن لەئەنجامی ئەو فیزو دەمارەی لەدنیا ئەتانکرد ، وەلەئەنجامی ئەوەدا ڕاستی نەئەچو بەگوێتاناو ، هەر بە ڕێگای لارو چەوتا ئەڕۆیشتن •

خوشکم گوێم لێبگرە باپێت بڵێم : ئەو تەڵەکە بازو دوو ڕوانەی قسەت بۆ ئەکەن و گوایە ئەیانەوێ ئامۆژگاریت بکەن ، ئەوانە ئامۆژگاری کردنی تۆیان مەبەست نیە ، بەڵکو مەبەستیان تێر کردنی ئارەزووی خۆیانە • قەسەم بەخوا ئەگەر منیش ئارەزووی نەفس و تێر کردنی جینسیم مەبەست بوایە هەروام پێ ئەوتی بگرە زیاتریشم پێ ئەوتی ، چونکە کەس نیە لەئارەزووی نەفس دوور بێ ، بەڵام نامەوێ لەپاشە ڕۆژدا تاوانی خۆیشم و تۆیش بێتە ملم •

ئەمەوێ گەڕانەوەی تۆ بۆڕێگای ڕاستو دامەزراویت لەسەر ئەو ڕێگایە ببێ بەچاکەیەك لەتای قەرازووی خێری مندا ، ئەمەوێ خویشم و تۆیش شتێکی بەرزترو بەنرختر لەئارەزووی نەفس بەدەس بێنین ، ئەویش ڕەزامەندی خوایە •

---

(١) الاحقاف : ٢٠ •

# دوا وتــەم

لەکۆتایيدا رووبەڕووی ئەو ئافرەتەی بڕوای بەیاساو حوکمی خوا هەیەو ئەم قسانەی من چووە بەدڵیا ، بەڵام واهەست ئەکات ماوەی نێوان ئەو ژیانەی ئەوو ، ئەو راستی‌یەی باوەڕی پێ هێناوە زۆر دوورە ، لەبەر ئەوە پاڵی ناچاری لێ ئەداتەوەو دەسەوسان لێی دائەنیشێو هیچ جوڵەیێ ناکا بۆ گۆڕانی ئەو وەزعەی تیا ئەژی ، وەعوزر: بۆ خواو بۆ خەڵکی ئەهێنێتەوەو ئەڵێ : نێوان منو راستی زۆر دوورەو ناتوانم ئەم بازە دوورە بدەم ؟ روو بەرووی ئەم خوشکە بەڕێزە ئەڵێم : خوشکی بەڕێزم ! راستە زۆر لەوانەی ڕێگای لارو چەوتیان گرتووە لەبەر ئەوە نیە کە بەو ڕێگایە رازینو حەز بەراستی ناکەن ، نەخێر بەڵکو زۆربەیان دان ئەنێن بەتاوانی خوایانداو ئەزانن دەرهەق فەرمانەکانی خوا کەمتەرخەمن • بەڵام بۆیە هەوڵی چارەسەر کردنی زروفی نالەباریان نادەن ؟ چونکە وائەزانن ئەو ماوەی لەنێوان ئـەوانو راستیدایە گــەلێ دوورەو بازێکی وای پێویستە لەوزەو توانای ئەواندا نیە •

بەڵام ئەمە بۆ چونێکی هەڵەو ناڕێکە ، چونکە ماوەی نێوان هەقو ناهەق بەوشێوە دەرئەکەوێ کە ئێمە تەماشای یەکەم پلەی دابەزین بکەین بۆ ناو زەلکاوی خراپەکاری ، لەگەڵ یەکەم پلــەی بــەرز بوونەوەدا بۆ چاکە • وەبەینی نێوان ئەم دوو پلەیەش تەنها یەك هەنگاوە •

ئـەو راستی‌یەی ئێمە لەلاپەڕەکانی پێشوودا روونمان کردەوە دوا پلــەی رەوشت بەرزیو مرۆڤایەتی نیە ، بەڵکو پلیکانەیەکە چەند پلەی

نزیک نزیکی تێدایە ، سەرەتاکەی لەکەناری ئەو ژیانە ناڕەوایەوە دەست پێ ئەکات کە تۆی تیا ئەژیت ، وەدوا پلەیشیان ئەتگەیەنێ بەسەر لوتکەی چاکەو رەزامەندی خـوا • وەپێویستی سەرشانی تۆ ئەوەیە پاش ئاگادار بوونت لەحوکمی خوایی ، وردە وردە بەرز بیتەوەو هەنگاو هەڵگری بەم پلیکانانەدا ، نەك بەیەك بازو یەك تەکان خۆت هەڵدەی بۆ دوایین پلە •

جا ئەگەر توانای ئەوەت نیەو زرووف یارمەتیت نادات حیجابێکی والەبەرکەی هەموو گیانت داپۆشێ ، بالەیەکەم هەنگاودا جلێکی لـەمە کەمتر بکەیت بەگوێرەی کاتو زروفی خۆت ، وەئەگەر بەهیچ شێوەیە لەیەکەم هەنگاودا توانای گوڕانی جلوبەرگت نیە ، هەر نابێ دەسەوسان لێی دابنیشیو باڵی لێ بدەیتەوە ، بەڵکو شتێکی لەمە کەمتر فەرزکە لەسەر خۆت وەك بەجێ هێنانی فەرزەکانتو خوێندنی هەندێ لەقورئان لەکاتی گەڕانەوەتدا بۆ ماڵەوە ، وەئـەگەر ئەوەندەیش ناتوانیو شـەیتان شتی ئاسانی لاگران کردووی ، جـار جـار پەنا بەرە بەر تەنیاییو خەڵوەت لەبەینی خـوتو خواداو سکاڵای حاڵی خۆت بکەو بیرێ لەپاشەرۆژی ترسناكو پرسامی ئـەو وەزعە ناهەموارە بکەرەوە کـە تۆی تیا ئەژیت ، وەبەدڵێکی راستو بـەکوڵەوە هاوار لـەخوا بکەو داوای یارمەتیدانی لێ بکە بۆ زاڵ بوونت بەسەر نەفسو شەیتاندا ، چونکە بەراستی پەنا بردن بـەخوا سەرچاوەی سەرکەوتنو رێگا دۆزینەوەیە ، وەهەرکەس یەکەم هەنگاوی لەم رێگایەدا نابێو ملی ئەم رێگایەی گرتبێ خوا گەیاندویەتیە ئاخر مەنزڵ •

بەڵام نەگبەتیو بەدبەختی گەورە ئـەوەیە راستی بزانیتو بڕوات پێی هەبێ کەچی خۆتی لێ تێنەگەیەنیو هیچ هەنگاوێکی بۆ هەڵنەنێی ، وەك وابزانی ئەم شتە پەیوەندی بەتۆوە نیە ، یان خوای گەورە دەستی

بێت ناگاو دەسەڵاتی بەسەرتا نیە ، یان قیامەت‌و پاشەرۆژ ئەوە ناهێنێ هیچ هەوڵێکی لـەپێناودا بدات ، یان واز لـەهیچ ئامانج‌و ئارەزوویەك بهێنێ بۆی ! •

ئـەم گوێ پێ‌نەدانە ئەبێتە گەورەترین هـۆی رژاندنی غـەزەب‌و سزای خوا لەدنیادا ، وەسزای خوا لەدنیا تەنها مەبەست پێی بەڵایەك نیە نووشت بێت ، بەڵکو بریتی‌یە لـەوەی ئەقڵی ئادەمیزاد ئەبەسرێ‌و دڵی رەش ئەبێ‌و هیچ ئامۆژگاری‌و ئاگاداری‌و ترساندنێك کاری تێ ناکات‌و دڵی بۆ راستی نەرم نابێت ــ خوا پەنامان بات ! ــ هەتا لـە ناکاو مردن یەخەی ئەگرێ‌و کۆڵ‌و باری پێ ئەپێچێتەوەو ماوەی تەوبەو گەڕانەوەی نادات ! وەك خوا دەربارەی ئەم جۆرە کەسانە ئەفەرموێ : ( ومن أظلم ممن ذكر بآيات ربه ثم أعرض عنها ؟ انا جعلنا على قلوبهم أكنة ان يفقهوه وفي آذانهم وقراً ، وان تدعهم الى الهدى فلن يهتدوا اذن أبداً )[1] •

مانای : کێ لـەو کەسە ستەمکارو تاوانبارترە کـە یادی بخەنەوە بەبەڵگەو نیشانەکانی خـواو ، راستی دینەکەی ، کەچی ئەم پشتی لێ هەڵکاو گوێی پێ نەداو بیر لەتاوانکاری خۆی نەکاتەوە ، بەراستی ئێمە بەردەیەکی رەشمان لەسەر دڵیان داناوە بـەهۆی تاوانباری خۆیانەوە ، کەراستی وەرناگرن‌و ناچێتـە دڵیانـەوە ، وەگوێیشیان لەئاستی راسـتیدا کـەڕو نابیسایە ، وەئەگەر بانگێشیان کـەیت بۆ رێگای راستی بەقسەت ناکەن‌و نایەن بەدەمتەوە •

* * *

خوشکی بەرێزم ! ئەگـەر بڕوات بـەخوا هـەبێ بێگومان بڕوات بەیاسای خواو بەرۆژی قیامەتیش هەیە کە رۆژی پاداش‌و حسابە ، ئەم

(١) الكهف : ٥٧ •

باوەڕەیش داوات لێ ئەکات گوێ بدەیتە ئەم قسانەی منو بیریان لێ بکەیتەوە ، هەتا باش بزانی کە من بەقسەی پڕوپوچ نەمخەڵاندویتو هەرچی حوکمی خوا نەبێ بۆم باس نەکردوی ، ئالەم کاتەدا پێویستە راپەڕی بۆ بەجێ هێنانی ئەم حوکمەو پلە پلە پیایدا سەرکەوی • خۆ ئەگەر ئارەزووی رابواردنی دنیاو پێوەنەکانی هەواو هەوەسو چاولێکەری خزمو هاوڕێکانت بەردەوام کە مەن کێشی ئەکردیو مۆڵەتی بیر کردنەوەی نەئەدای ؛ هیچ بالەم کاتەدا پەشیمانیو خەفەت بۆ ئەمە داتبگرێو روبکەرە قاپی رەحمەتی خواو لاوازیو بێ دەسەلاتی خۆتی بۆ دەربڕەو ، لەقولایی دڵو دەرونتەوە دەستبکە بەگریانو پاڕانەوە ، سابەڵکو هێزو توانات بداتێو لەچنگی چەپەڵی نەفسو چاولێکەری ئەمو ئەوو عاداتو نەریتی نەفامی ئەم زەمانە ئازادوو دەربازت کات •

خۆ ئەگەر باوەڕەکەت راینەپەڕانی بۆ هیچ کام لەمانەو دڵت هیچ خورپەیەکی تێ نەکەوتوو گوێت بەم قسانە نەدا کەمن بۆم کردی ، ئەوە ئەو کاتە بکەوەرە گومان لەباوەڕەکەتداو بزانە تەواو نیە ، وەئەگەر ــ خوا نەخواستە ــ ئاوا بەردەوام بیت ئەوە پاشە رۆژێکی ترسناك چاوەڕوانت ئەکاو دەرباز بونو راکردنت لەدەستی نیە •

بیشزانە ئەی خوشکم رابواردنی ناو نازو نیعمەتی ئەم ژیانە هەرچەند شیرینو بەتام بێت ، هاکەزانیت مردن هۆشی پێ کردیتەوەو دوایین تیکەی لەگەروتدا گیراند • وەسوێندم بەخوا ئەورۆژەیش نزیکە لێمانەوە هاکەزانی گیرۆدەی بوین !•

خوشکی بەرێز ! بزانە ئەمرۆ هەر لاوێ گیرۆدەی جوانیو لارو لەنجەی تۆ بوبێو لەرێگای تۆوە توشی گوناهێ بوبێ بەمەرجێ خەتای تۆی تیابێت ، سبەی رۆژ خوا هەقی نالەی دەروونی لەتۆ ئەکاتەوەو ، تووشی گەورەترین سزات ئەکات !•

لـەکۆتایی ئـەم نامیلکەیـەدا یادیکی ئەوقسانـەم بکـەرەوە کـە لەسـەرەتاوە پێم ووتی : کـە ئافـرەت لـەژیانی پیـاودا ترسـناکترین تاقیکردنەوەیە ، کەوابوو تۆیش یارمەتی پیاوان بدە بۆ رازی کردنی خواو پاراستنی سنووری دینەکەی ئەو ، وەدەخیلە نەکەی ببیتە داوی شەیتان بۆ هەڵخزاندنی پیاوان بەرەو خراپەو تاوانکاری و دەرچوون لەسنووری خوایی !•

وەلەکاتی گەڕانەوەتدا بۆ لای لەیادت نەچێ دوعای چاکەو داوای لێ بوردن بکە لەخوا بۆ نوسەرو وەرگێڕی ئەم نامیلکەیە بەڵکە خوا لێمان ببورێ ! •

خوایش دەسگیرۆیی هەموو لایەکمان بکات بۆ رێگای سەرفەرازی !
آمین • وصلی الله علی سیدنا محمد وآله وصحبه اجمعین •

